# قەتڵوعامی کورد لە تورکیا

لە فرانسییەوە وەرگێڕانی،
پێشەکی و پەراوێزنووسیی
نەجاتی عەبدوڵڵا

بلاوكراوەی

جڤاتا وەلاتیێ كوردا

(خۆیبوون)

ژمارە ٢

# قەتڵوعامی كورد

# لە توركیا

لە فەرانسییەوە وەرگێڕانی بۆ كوردی،

پێشەكی و پەراوێزنووسی

نەجاتی عەبدوڵلا

بنكەی ژین

سلێمانی ٢-٨

٣٦٤.١٥١
ن ٩٥٢ ئەجاتی عەبدوڵڵا
قەتڵوعامی کورد لە تورکیا/ وەگێڕانی نەجاتی عەبدوڵڵا. -
سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٨.
١١٥ل: ١٤.٥×٢١ سم، وێنە، بەڵگەنامە، زنجیرە؛ ٧٩.
١- کوردستانی تورکیا- جینۆساید ٢- جینۆساید- کورد
٣- ناونیشان ٤- زنجیرە؛ ٧٩
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح
زنجیرە: ٧٩
کتێب: قەتڵوعامی کورد لە تورکیا
نووسینی: کۆمەڵەی خۆیبوون
بابەت: بڵاوکراوەی ژمارە ٢ی خۆیبوون، قاهیرە، ١٩٢٨
لە فەرەنسییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا
تایپ و مۆنتاژ و هەڵەچنی: وەرگێڕ
ڕووبەرگ: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ٢٠٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن: ٩٣٤ی ساڵی ٢٠٠٧
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:
*Les massacres Kurdes en Turquie*, Le Caire, 1928.

لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان، سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٣٣
ئۆرمال: ٢١٢٩١٠٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٢ سانا: ١١٢٨٣٠٩
E-mail: bnkaizhin@yahoo.com

ئەم وەرگێڕانە

بە گیانی پیرۆزی

سورەیا بەدرخان بەگ،

ئەو پیاوەی کە کورد و کوردستانی

بە خوێنەری ئینگلیز و فرەنسی ناساند،

بە هەموو لەو کیژ و کچۆڵە نازادارانەی

هەر تەنها لەبەر کوردبوون هەتک کران،

بە هەموو ئەو سەربازە وتانەی وا

ماڵ و خانوویان بەسەردا ڕووخێنرا،

بە هەموو ئەوانەی کە هەر تەنها لەبەر کوردبوونیان

شاربەدەر کران و لە قوژبنێکدا

بێ گۆڕ و بێ کفن ژێر خاک نران

و

بە هەموو لەوانەی وا تا بەردەم پەتی سێدارە هەر بۆ

کورد و کوردستان ژیان،

دیاری و پێشکەشـــە

وەرگێڕ

## پێشەکیی وەرگێڕ

مێژووی ئێمە نەک هەر ئاڵقەکانی دەورانی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست و مۆدێرنی ونە، بەڵکوو بەشی زۆری مێژووی سەدەی بیستەمیشمان تا ئێستە ونە و گەلێک ئاڵقەی زۆر گرینگ و هەستیارمان فەوتاون، یاخود هێشتا نەکەوتوونەتە بەردەست. ڕەنگە ئێرە نە جێگەی ئاخ و داخ هەڵکێشان و نە کاتی ئەوەشمان بەدەستەوە مابێ تا دەستەوئەژنۆ بۆی دابنیشین. ئەمڕۆ ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد بە هەر چوارپارچەی گۆی زەویدا پەرش و بڵاو بوونەتەوە، کتێبخانە و ئەرشیڤخانەکانی وڵاتانی داگیرکاری کوردستان (ئەستەموول، ئەنقەرە، تاران، تەورێز، دیمەشق، بەغدا، لوبنان و شارەکانی دیکە) و هەروەها ئەرشیڤخانە و حەشارگە و کەلێن و قوژبنی کتێبخانەکانی ئەورووپا، ئەمریکا و ڕووسیا، ڕەنگە هێشتا سەدان و بگرە هەزاران نامیلکە و کتێب و بەڵگەنامەی نایابیان تێدا دەستبکەوێ کە پێویستە هەرچی زووتر وەکوو خۆیان بە شەرح و لێکدانەوەی زیادەوە سەرلەنوێ بکرێنەوە بە کوردی و بهێنرێنەوە ناو کتێبخانەی کوردی و هاوکات چەندین دانەشیان لێ بگەیەنرێنەوە ناو کتێبخانەکانی کوردستان.

دوای ئەم پێشەکیە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم بەڕاستی ئەرکی مێژوونووس و لێکۆڵەرەوەی کورد گەلێك لە ئەرك و ماندووبوونی مێژوونووس و لێکۆڵەرەوەی نەتەوەکانی دیکە قورستر و سەختترە.
ئەم کتێبەی بەردەستتان کە بڵاوکراوەی ژمارە ٢ی "خۆیبوون"ـە و ساڵی ١٩٢٨ لە قاهیرە چاپکراوە، پێم وایە تەنها سێ دانەی چاپکراوی ماوە؛ دانەیەکیان لە کتێبخانەی نیشتمانیی پاریس، دانەیەکی چاپکراوی دیکە لە کتێبخانەی دەوڵەتی لە بەرلین و دانەیەکیش لە کتێبخانەی ئەنستیتۆی کورد لە پاریس پارێزراوە.
دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئەم بڵاوکراوەیە هەر هەمان ساڵ لەگەڵ چاپە فرانسییەکەیدا، چاپە ئینگلیزی و تورکیی عوسمانیەکەشی بڵاو کراوەتەوە، کە بەداخەوە ئەمڕۆ چاپە تورکیەکەی هیچ شوێنەوارێکی دیار نییە و چاپە ئینگلیزیەکەش پێم وایە تەنها یەك دانەی چاپکراوی زیاتر نەمابێتەوە. ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێم کەوا ئەم بڵاوکراوەیە بەبێ هیچ گومانێك لە نووسینی سورەیا بەدرخانە، وەك چۆن لە سەرجەمی هەر هەشت بڵاوکراوەکانی خۆیبوون شەشیان، واتە بڵاوکراوەکانی ژمارە (6,5,4,3,2,1) هەر هەموویان لە نووسینی ئەو زاتەن. بەڵام بڵاوکراوەی ژمارە ٤ و ژمارە ٥، کە یەك لەدوای یەك بە تورکی و عەرەبی بڵاو کراونەتەوە، پێم وابێ ژمارە ٥ یان محەمەد عەلی عەونی کردوویە بە عەرەبی و بۆ بڵاوکراوەی ژمارە ٤یش، نە هیچ زانیاریەکم لەبەر دەستە و نە هیچ کەسێکیش تا نێستە ئەم بڵاوکراوەیەی بینیوە.
دواجار حەزدەکەم لێرەدا ئەوە بڵێم کە مێژووی خۆیبوون لە هەموو ڕووێکەوە شایانی چەندین دکتۆرانامە و ماجیستێرنامەی سەرکەوتووە. گەڕان و سوڕان بەناو ئەرشیفخانەکانی پاریس،

لەندەن، ئەمریکا، شام و لوبناندا، ڕەنگە هێشتا سەدان بەڵگەنامەی نایاب و تازەمان لە بارەی خۆیبوونەوە بخەنە بەردەست، بەوهیوایەی کە ئەم قۆناغەی مێژووی کورد بە تەواوەتی هەقی خۆی بدرێتێ. بەر لەکۆتایش گەلێك سوپاسی مامۆستایان ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح دەکەم کە بەردەوام پاڵپشتی گەورەی کارەکانم بوون و سێبەری برایەتییان هەمیشە گەلێك لە ماندووبوون و شەکەتیەکانی کارکردنی لەبیر بردوومەتەوە، خودا نموونەیان هەر زۆر بکات.

نەجاتی عەبدوڵڵا

پاریس،

١٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧

# جڤاتا وەڵاتیێ کوردا "خۆیبوون"

## مێژوو، ئاسنامە و بڵاوکراوەکانی

### (٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧-١٩٤٦)

کوردستان تا دوای یەکەم جەنگی جیهانی ئاسنامەی مێژوویی-کولتووری خۆی هەبوە، بەڵام هەرگیز ئاسنامەی سیاسیی نەبوە، لەم ڕووەوە کوردستان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و دەستپێکی سەدەی بیستەمدا، لەناو تەنگژەیەکی گەورەی ئاسنامەی سیاسییدا بووە. تا وەکو دوای کۆدێتای تورکە-لاوەکان ١٩٠٨، کەسایەتییە سیاسییە کوردەکان هەر لەناو بزووتنەوەی ئیتیحاد و تەرەقیدا کاریان دەکرد. ئۆرگانی ئیتحاد و تەرەقی (عوسمانلی) سەرنووسەرەکەی دوکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت بوو. هەتا یەکەمین ڕۆژنامەی کوردستان ( نیسانی ساڵی ١٨٩٨) کە وەکوو ئۆرگانی ئۆپۆزسیۆنی کورد حسێب دەکرا، بەشێك بووە لە ئۆپۆزسیۆنی تورکە-لاوەکان بە بێ ئەوەی هێندە جوداخواز بووبێ، بەڵام ڕۆژنامەی کوردستان بەرەی بناغەی ناسیۆنالیزمی کولتووریی کوردی دامەزراند[1].

---

[1] Hamit Bozarslan, *La question kurde. Etat et minorités au Moyen-Orient*, Ed. Presses de sciences politiques, Paris, 1997, p. 24

ڕاستییەکەی چەمکی ناسیۆنالیزم درەنگتر لەناو کەمینە نەتەوە موسڵمانەکانی ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا سەریهەڵدا. بێگومان کورد وەکوو کەسایەتی بەشداریی لە بزوتتنەوەی تورکە-لاوەکاندا کردووە، بەڵام وەك گرۆ یا وەك دەستەبەندی سیاسی بەشدارییەکی وای لە بزووتنەوەی ئۆپۆزسیۆندا نەبوە. بۆ نموونە، دوای کۆنگرەی ئیتیحاد و تەرەقی ساڵی ١٩٠٧، کاتێك ئۆپۆزسیۆن دەیەویست دووبارە هاوبەندیی پەیمانێکی تاکتیکی نوێ بکاتەوە و یەکێتییەکی ئۆپۆزسیۆنی یەکگرتووی عوسمانی پێك بهێنێ، نەیتوانی لەمەدا سەرکەوتوو بێت. مالومیان* ڕای دەگەیەنێ: ((*سەرباری ئەو یەکێتییەی وا لەنێوان عەرەب، ئەرمەنی، جوولەکە و تورکدا هەیە، کۆمیتە شۆڕشگێڕەکانی مەکدۆنیا لەمێژە لەگەڵ دروزشاك رێکەوتنیان هەیە و هاتنە ناوەوەیان زامنە. بە هەمان شێوە، ئەلبانی و گرۆیەکانی دێنە ناوەوە. هەرچی کوردەکانە، بەداخەوە گرۆ (کۆمەڵە)ی سیاسییان نییە، بەڵام ئێمە لەگەڵ زۆریاندا لە پێوەندیداین و لەوبارەیەوە هیوایەکی زۆرمان هەیە"*[2].

تەممووزی ١٩٠٨، سوپا لە مەکدۆنیا ڕاپەڕی و لە ٢٣ی تەممووزدا سوڵتان عەبدولحەمید ناچارکرا جاڕی مەشرووتە بدات. ئەوە لەم دەورانە نوێیەی ژیانی سیاسیی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوەیە کە ڕووناکبیرانی کورد باسی "کوردبوون- عوسمانی بوون"ی خۆیان دەکەن. بەڵام بەهاری ئازادی هێندەی نەبرد و ٢٧ی

---

Malumian *

[2] M. Sükrü Hanioglu, *Preparation for a revolution : the Young Turks, 1902-1908*, Oxford ; New York : Oxford University Press, Coll. Studies in Middle Eastern history, 2001, pp. 206-207.

ئەپریلی ١٩٠٩ ئیتیحاد و تەرەقی کۆدێتایان کرد و تەنگژەی بالْقان درزێکی گەورەی خستە ناو پرەنسیپەکانی عوسمانیزم و ئەمە لەگەڵ خۆیدا بیرۆکەی بە عوسمانیزەکردنی هەموو ڕەعیەتگەلی ناو ئیمپراتۆریای عوسمانی هێنایە پێشەوە. سیر گێرارد لۆتەر*، باڵوێزی بریتانی تێبینیی ئەوەی کردووە کە لەم دەورانەدا ((تورکە-لاوەکان لە بیری خۆیاندا "عوسمانی" واتای "تورک"ی دەگەیاند و سیاسەتی ئەوکاتەیان "عوسمانیزەکردن" شێوازێك بووە بۆ تواندنەوەی ڕەگەزە ناتورکەکان لەناو کەمینەیەکی تورکدا))[3]. لە یەکەم هەنگاودا جەمعییەتی ئیتیحاد و تەرەقی بۆ بەرگرتن و لغاوکردنی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکان، ویستیان کۆمەڵەیەکی گشتگیر لەگەڵ کۆمەڵە ڕووناکبیری و سیاسییەکانی دیکە، بە پارتی ئینتیلاف لیبرالیشەوە، بە ناوی کۆمەڵەی هاوپەیمانیی عوسمانییەوە دروست بکەن، دوای چەند مانگێك یاسای ڕێکخستن و کۆبوونەوەی نوێ دانراو و هەموو ئەو ڕێکخراوانەی کە بنکەیەکی ئێتنیکییان هەبوو، قەدەغە کران[4].

ساڵی ١٩١١ ئۆپۆزسیۆنی جەمعییەتی ئیتیحاد و تەرەقی بە کوردیشەوە لە دەوری پارتی ئینتیلاف لیبراڵ کۆبوونەوە. لە یەکەم هەڵبژاردنی ئازاددا کە بەهاری ١٩١٢ ساز کرا، پارتی ئینتلاف لیبراڵ گەیشتە دەسەلات و لەم سۆنگەیەوە چەند دەروویەکی کولتووری بەڕووی کورددا کرانەوە، بەلام هێندەی نەبرد دیسان ئیتیحاد و

---

Sir Gerard Lowther *

[3] Vahakn N. Dadrian, *Autopsie du génocide Arménien*, traduit de l'anglais par Marc et Mikaël Nichanian, Ed. Compexe, Coll. Historiques, Bruxelles, 1995, p. 57.

[4] حسن قايالي، *الحركة القومية العربية بعيون عثمانية ١٩٠٨-١٩١٨*، ترجمة: فاضل جنكر، دار قدمس، دمشق، ٢٠٠٢، ص: ١٤١-١٤٢.

ئەرەقییەکان هاتنەوە سەر حوکم و لێرەوە ئیدی بەڕاستی چەمکی "ناسیۆنالیزمی تورك" جێگەی چەمکی "عوسمانیزم" و "پان-عوسمانیزم" دەگرێتەوە.

لە لێکۆڵینەوەی مێژووی ناسیۆنالیزمی کورددا هەڵەیەکی گەورە دەکەین ئەگەر بەر لە دامەزراندنی (خۆیبوون) لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٧دا باسی ناسیۆنالیزمی کورد بکەین. ڕاستە بەر لە دامەزراندنی "خۆیبوون" کۆمەڵێك یانە و ڕێکخراوی کورد لەدایك بوون، بەڵام ئەمانە هەرگیز هەڵگری پرۆژەیەکی سیاسیی جیاییخواز نەبوون کە جەماوەر بۆ ئامانجە نەتەوەییەکان جۆش بدەن. لەوەتای ساڵی ١٩٠٨ ەوە، دەکرێ باسی جۆرێك لە "کوردایەتی" یان "کوردیزم" بکەین کە زۆر بە ئاستەم دەیتوانی و دەیەویست "کوردایەتی" لە پەراوێزی "عوسمانیزم"دا بکات. سەرباری ئەمەش ئەم بزووتنەوە کوردایەتییە زیاتر لەناو ڕووناکبیرانی کورددا بوو و بە هیچ شێوەیەك نەبووبووە دروشمگەلی ناو کۆمەڵانی خەڵك و ئایدیای سەربەخۆیی لەناو جەماوەردا تا ڕادەیەکی تەواو هەر ون بوو. لەم ڕوانگەیەوە تا دوای تێکشکانی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥، هۆشیاریی "کوردبوون" لەناو خەڵکدا هێندە کز بوو کە دەکرێ بە نەبووی دابنێین. ڕەوتی سیاسی زیاتر لەژێر بەها ئایینیەکاندا بوو و ئەوەندەی کورد لە دەوری دروشمەکانی مستەفا کەمال کۆبووبوونەوە، کەمتر لە چارەگێکی ئەوە لە دەوری ڕێکخراو و یانە کوردییەکان کۆنەبوونەوە. کورد، ئاستی خۆنواندنی ناوچەییدا؛ تاوەکوو کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان و وردتر تا دوای تێشکان و سەرکوتی خوێناویی شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٢٥، نەیویستووە لەو ڕەوشە جیۆپۆلیتیکە جیابێتەوە کە بەسەریدا سەپێندرابوو.

هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت (١٩٢٤) بە جۆرێك لە جۆرەکان پچڕانی ئەو تاڵە داوەی ئایین بوو کە چەندین سەدە بوو کورد و تورکی بەیەکەوە بەستبۆوە، بەڵام ئەمە هەرگیز بەو مانایە نییە کە مەبەستم ئەوەبێ بڵێم شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ و ساڵەکانی دواتر لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتەوە سەریان هەڵداوە.

شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ و دواتر دامرکاندنەوەی خوێناوییەکەی، لەگەڵ خۆیدا پەیامی لەدایکبوونی درەنگ وەختی "ناسیۆنالیزمی کورد"ی ڕاگەیاند، کە دەکرێ دامەزراندنی خۆیبوون لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا لەنێو دوو کەوانەدا بە سەرەتا و دەستپێکی زۆر سەرەتایی ناسیۆنالیزمی کورد دابنێین.

خۆیبوون هەڵگری پرۆژەی سیاسیی سەربەخۆیی کوردستان بوو و کەم و زۆر بەناو هەر چوار پارچەی کوردستاندا ڕۆچووبوو. ئەوەی خۆیبوون لە هەموان زیاتر بایەخی پێدەدا، بواری ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندە بوو، بە زمانە زیندووەکانی (فەرەنسی، ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی) لە بڵاوکراوە و بەیاننامەی بڵاو دەکردەوە" بەمە سەرچاوەیەکی زۆر دەوڵەمەندی لەدوای خۆیەوە جێهێشتووە کە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی خۆیبوون و ناسیۆنالیزمی کورد سەرچاوەیەکی گەورەی دەستی یەکەمن.

قەتڵوعامی دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ و ڕاوەدوونانی ڕووناکبیرانی کورد دوای بەجێهێشتنی ئەستەموول، کێشایەوە بۆ ئەوەی کە بەشی زۆریان لە شام و لوبنان لەژێر دەسەڵاتی ئینتدابی فرانسا گیرسانەوە. ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٧ ڕێبەر و ئەندامانی چوار کۆمەڵەی سیاسیی کوردی: جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، پارتی

نەتەوەیی کورد، کۆمیتەی سەربەخۆیی کورد و کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد، دوای چەندین کۆبوونەوە ڕۆژی ٥ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ لە لوبنان یەکەمین کۆنگرەیان بەست، و بەمشێوەیە (جڤاتا وەڵاتیێ کوردا، جڤاتا کوردان یان خۆیبوون) لەدایك بوو.

بەگوێرەی چەندین لیست کە لە لایەن دەزگاکانی زانیارییەوە ئامادە کراون، دەتوانین ئەوە دووپات بکەینەوە کە کەسایەتییە سەرەکییەکانی خۆیبوون لەکاتی دروستبوونیدا ئەمانە بوون: جەلادەت بەدرخان (١٨٩٣-١٩٥١)؛ کامەران بەدرخان (١٨٩٥-١٩٧٨)، سورەیا بەدرخان (١٨٨٣-١٩٣٨)؛ مەمدووح سەلیم (١٨٩٧-١٩٧٦)، محەمەد شوکری سەگبان (١٨٨١-١٩٦٠)؛ ئیحسان نووری (١٨٩٣-١٩٧٦)، عەلی ئیلامی (١٨٨٠-١٩٦٤)، فەهمی لیجی(١٨٨٧-١٩٦٧)، حاجۆ ئاغا (١٨٨٨-١٩٤٠)؛ ئەمین ڕامان (ئەمین پەریخان) (؟-١٩٢٨)؛ بوزان (١٨٩٥-١٩٦٨) ، مستەفا شاهین (؟-١٩٥٣)، شێخ عەبدولڕەحمان گارسی (١٨٩٦-١٩٣٢) و ڕەفعەت زادە (؟-١٩٢٠) دواتر گەیشتنی شاوارەی نوێی کورد لە ساڵی ١٩٢٩دا خوێنێکی تازەی بە ڕێکخراوەکە بەخشی. لەمانەی دوایی ئەکرەم جەمیل پاشا (١٨٩١-١٩٧٤)؛ قەدری جەمیل پاشا (١٨٩٢-١٩٧٣)، عوسمان صەبری (١٩٠٥-١٩٩٣)؛ ئەحمەد نافیز زازا (١٩٠٢-١٩٦٨)، عارف عەباس (١٩٠٠-١٩٨٤)، و شەوکەت زولفی (١٨٩٩-؟).[5]

---

[5] *La Ligue national kurde Khoyboun*. Documents recueillis, annotés et présentés par Jordi Tejel Gorgas, Etudes Kurdes, N° hors série III-juin 2007, Paris, pp. 8-9.

## کۆتایی خۆیبوون

سەرکەوتنی شوورەوی بەسەر نازیزم لە هەموو جیهاندا ڕوویکی گەشی بە کۆمۆنیزم بەخشی و وەچەی نویی گۆڕەپانی کوردایەتی زیاتر کرانەوەیان بەرەو کۆمۆنیزم تیدا بوو. ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان هەموویان پاڵپشت و پەناگەی حوکمەتە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە بوون، ڕەنگە تاکە "نوا"یێك بۆ ئەم وەچەیە کرانەوە بووبێ بەرەو ڕووی بزووتنەوەی کۆمونیزم، بەو پێیە کەوا تاکە دەروو بوو کەوا جیهانێکی "یەکسان" و "بێ چەوساندنەوە" بۆ ئینسانی کورد دابین بکات. بەمشێوەیە وەچەی گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان کۆمەڵەیەکی نوێیان بە ناوی کۆمەڵەی کورد* ( یەکبوون و ئازادی) لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزراند. ئەم کۆمەڵەیە زیاتر بۆ ئەوە بوو، بەبێ ئەوەی خۆیبوون تووشی ئینشقاق بکات و پارچە پارچە ببێ بتوانێ خۆیبوون بگرێتەوە خۆ. ئەم کۆمەڵەیە لە ڕووی پێکهاتە و پرۆگرامەوە گەلێك لە خۆیبوون، نزیك بوو و دواجار برێك لە سەرکردە کۆنەکانی خۆیبوون لەوانە قەدری جەمیل پاشا و ئەکرەم جەمیل پاشا، چوونە ناو کۆمەڵەی نوێ و لەگەڵ ساڵی ١٩٤٦ ئیدی خۆیبوون بە تەواوی کۆتایی بە ژیانی سیاسیی هات.

---

* Ligue Kurde

## بیبلیۆگرافیای کرۆنۆلۆژی بڵاوکراوەکانی

## (خۆیبوون)

بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی کە "تا ئێستە" دەست ئێمە کەوتوون و بە پێی بەشوێنداچوونەکانی ئێمە، کۆمەڵەی خۆیبوون ( جڤاتا کوردان، جڤاتا وەڵاتیێ کوردا) بەدەر لە نامیلکەکانی پەیڕەو و پرۆگرام و بەیاننامە سیاسییەکان، تەنها هەشت بڵاوکراوەی بەچاپ گەیاندووە کە بە زمانەکانی (٢ یان ئینگلیزی، ٣ یان فرەنسی، ٣ یان تورکی و عەرەبی)ن، کە لەوانە تەنها بڵاوکراوەی ژمارە ٤ و ژمارە ٨ بە تورکییە و بڵاوکراوەی ژمارە چوارەکەی تا ئێستە ونە و دیار نییە، بەڵام خۆشبەختانە دەقە فرەنسییەکە و ئینگلیزییەکەی لەبەر دەستە و ئەمە هەمان ئەو کتێبەی بەردەستتانە کە لێرەدا کراوە بە کوردی. مــن پــێم وایــە زنجــیرەی بڵاوکراوەکــانی خۆیبـــوون بەمشێوەیەیە:

### ١٩٢٨

1-Sureya Bédir Khan, *The Case of Kurdistan against Turkey*[6]. Published by the authority of Hoyboon Supreme Council of the Kurdish Government, Philadelphia, 1928, (72 p).

---

[6] ئەم کتێبە گەرچی لەسەری نەنووسراوە بڵاوکراوەی ژمارە یەك، بەڵام بە هەموو پێوایەنەیەك دەبێ ئەمە بڵاوکراوەی ژمارە یەکی خۆیبوون بێ. ئەم بڵاوکراوەیە ئەم ساڵانەی دوایی دووجار بە ئینگلیزی دووبارە چاپکراوەتەوە، جاری یەکەمیان ساڵی ١٩٩٥ بە نۆفسێت لە لایەن کتێبخانەی سارا لە ستۆکهۆڵم بڵاو کرایەوە، جاری دووەمیشیان لە ژمارە ١ و ٢ ی گۆواری *The International Journal of Kurdish Studies*، ساڵی ٢٠٠٤، لاپەڕە ١١٢–١٥٧دووبارە بڵاوکراوەتەوە. ئەم نامیلکەیە لە هەموو ڕوونکەوە شایانی ئەوەیە بکرێتە کوردی و بهێنرێتەوە ناو کتێبخانەی کوردی.

2-Ligue National Kurde (Hoyboun), *Les massacres Kurdes en Turquie*[7], Publication n° 2, Le Caire, Imp. Paul Barbey, 1928, (41p).

3- Kurdish National Lague, *The massacres of Kurds in Turkey*, Le Caire, 1928, ( ? p)[8].

4- جڤاتا وەلاتیێ کوردا، *کردلرن ترکیاده قتل عامی*[9]، قاهره، ١٩٢٨

١٩٣٠

5- د. بلەج.شیرکوه، *القضية الكردية ماضي الكرد وحاضرهم*، (جمعية خويبون الكردية الوطنية) -النشرة الخامسة- مطبعة السعادة بجوار محافظة مصر، القاهرة، ١٩٣٠، (١١٢ص)[10].

---

[7] ئەمەیان ئەم کتێبەی بەردەستتانە کە ڕاستەوخۆ لە فڕانسییەوە کراوە بە کوردی.

[8] من بۆ خۆم ئەم چاپە ئینگلیزییەم نەبینیوە کە چاپی ئینگلیزیی هەمان ئەو کتێبەیە وا ئێمە لێرە لە فەرەنسییەوە کردوومانە بە کوردی، بەڵام بەو پێیەی کە موحەممەد بایرق لە کتێبەکەی خۆیدا وێنەی بەرگی بڵاوکراوەکە و تەرجەمەیەکی (کورتکراوەی) تورکیی لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕاویشی لەناو کتێبەکەیدا بڵاو کردۆتەوە، هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەبێ چاپە ئینگلیزییەکەی مابێ. بۆ تەماشاکردنی بەرگی کتێبە ئینگلیزییەکە و وەرگێڕانە تورکییە کورتکراوەکە بڕوانە: Mehmet Bayrak, *Kürdoloji Belgeleri*, Öz-ge Yayinlan 17, Ankara, 1994, pp. 40-56.

[9] بەداخەوە چاپی تورکیی عوسمانیی ئەم بڵاوکراوەیە تا ئێستە لە هیچ لایەکەوە دیار نییە و وا پێدەچێ هەموو دانەکانی فەوتابن، بەڵام خۆشبەختانە چاپە فەرەنسی و ئینگلیزییەکەی ماوە.

[10] ئەم بڵاوکراوەیە عەرەبییەی ژمارە ٥ ی خۆیبوون لە لایەن محەممەد حەمە باقییەوە لە عەرەبییەوە کراوە بە کوردی و سێ جار چاپکراوە، بڕوانە: دکتۆر بلەج شێرگۆ: کێشەی کورد، مێژینە و ئێستای کورد، یەکەم چاپ، ١٩٨٦، دووەم چاپ ١٩٩٠، چاپەمەنی محەمەدی-سەقز و سێیەم چاپ، تەورێز، ١٩٩١. حەزدەکەم لێرەدا ئەوە بڵێم کەوا چاپی عەرەبی و چاپی فەرەنسیی ئەم بڵاوکراوەیە جیاوازییەکی گەلێك زۆریان هەیە. جگە لەوە

6-Docteur Blech Chirguh, *La question kurde, ses origines et ses causes*, publication de la Ligue Nationale Kurde (Hoyboun), n° 6, La Caire, Imprimerie Paul Barbey, 1930, (56p).

**١٩٣٤**

7-Herkol Azizan, *De la question kurde. La loi de déportation et de dispersion des Kurdes*[11], N° 8, Damas, 1934, (40 p).

**٨- جمعية خويبون الكردية الوطنية -النشرة الثامنة- *الكرد ازاء العلو العام التركي* سنة ١٩٣٣، ١٩٣٤، (٢٤ ص)**[١٢]

## بەیاننامە ، نامە و بانگەواز بۆ شۆڕش

---

نازانم بۆچی کاکە حەمە بەشی مێژووەکەی تەرجەمە نەکردووە کە یەکەمین بەشی عەرەبیی کتێبەکەیە. ئێمە ئەم بڵاوکراوەیەمان ڕاستەوخۆ لە فەڕەنسییەوە کردووە بە کوردی و بە هیواین لە داهاتوویێکی زۆر نزیکدا چاپی بکەین.

[11] ئەم کتێبە بە فەڕەنسی نووسراوە و تەرجەمەی تورکیی نوێش کراوە و تەرجەمە تورکیەکە و ئەسڵە فەڕەنسییەکە ساڵی ١٩٩٧ بەسەر یەکەوە لە لایەن دەزگەی چاپەمەنی ئاڤێستاوە دووبارە بڵاوکراونەوە، بڕوانە: Celadet Alî Bedirxan, *Kürt Sorunu Üzerine*, Avesta, Istanbul, 1997 هەمان نامیلکە لە لایەن زریان ڕۆژهەلاتییەوە لە تورکییەوە کراوە بە کوردی، بڕوانە: جەلادەت عالی بەدرخان، *لەبارەی کێشەی کوردەوە، سەبارەت بە دوورخستنەوە و بڵاوەپێکردنی کوردان*، لە تورکییەوە وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەلاتی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، (٦٠ لاپەڕە). ئەم بڵاوکرایەوە وا پێدەچێ بڵاوکراوەی ژمارە ٧ بووبێت، چونکە لە بڵاوکراوەکەی دواتریشدا هەر نووسراوە بڵاوکراوەی ژمارە ٨، بۆیە بە هەموو بارێکدا دەبێ یەکێک لەم دوانەی دوایی بڵاوکراوەی ژمارە ٧ بێت

[12] ئەم بڵاوکراوەیە بە عەرەبی و تورکیی عوسمانلی بەسەریەکەوە بڵاو کراوەتەوە، بەشە عەرەبییەکەی ل: ٣-١٥ و بەشە تورکییەکەشی بەناوی (*تورك علو عمومیسی قارشیسندە كوردلر*) لە لاپەڕە ١٦-٢٤ بڵاو کراوەتەوە.

١- جڤاتا وەلاتيێ كوردا (خۆيبون)، "*خويبون"ك امريقانەكى كوردلره بياننامەسى*"[١٣]، سرنيوەك، نومرو:٧١، ٢٠ حزيران، ١٩٢٨.

٢- بانگــەوازی ســورەیا بــەدرخان بـۆ ئینگلیــز بـۆ یارمــەتی، ٣٠ حوزەیرانی ١٩٢٩.

٣- بانگەواز بۆ شۆڕش، ١٦ ی حوزەیرانی ١٩٣٢.

٤- بانگەوازی خۆیبوون بۆ عارف بەگ ئەفەندی، ٢٨-٨-١٩٣٢.

٥- نامەی خۆیبوون بۆ چەرچل، ١٢ ی ئاداری ١٩٤٣.

---

[13] بۆ تەرجەمەی فەرەنسیی ئەم بەیاننامەیەی بڕوانە: *La Ligue national kurde Khoyboun*, Documents recueillis, annotés et présentés par Jordi Tejel Gorgas, *Etudes Kurdes*, N° hors série III-juin 2007, Paris, pp: 47-50.
بۆ تەرجەمەی عەرەبیش بڕوانە: الدكتور عبدالستار طاهر شريف، *الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨*، ص: ٧٠-٧٣.

PUBLICATION
DE LA
LIGUE NATIONALE KURDE
HOYBOUN
No 2

# LES MASSACRES KURDES EN TURQUIE

LE CAIRE
IMP. PAUL BARBEY

1928

بەرگی کتێبی "قەتلوعامی کورد لە تورکیا" بە فرەنسی،

چاپی قاهیرە، ١٩٢٨

# Avant l'Armistice

La question Kurde, les massacres sanglants en masse des Kurdes, sont des questions qui passent presque inaperçus aux yeux du monde civilisé parmi les évènements journaliers qui accaparent son attention et surtout grâce aux mesures rigoureuses et à la censure très sévère pratiquées par les Turcs pour couvrir leur crime.

En disant monde civilisé, c'est plus tôt les nations et non les gouvernements que nous voulons nommer. Car il est bien sûr que les grandes puissances mandataires qui sont établis aux frontières des champs de massacres sont, sans doute au courant de tous ces crimes jusqu'aux menus détails. Il ne se passe pas un jour sans que quelques Kurdes, ayant eu la chance de sauver leur tête de la hâche turque, ne se réfugient aux pays voisins et ne racontent à la frontière, pour obtenir le passage, leur malheur et le malheur national.

Mais une question Kurde n'existe point pour l'opinion publique civilisée, car cette opinion n'est point au courant de ces événements, ou bien les échos qui lui en parviennent sont très incomplets.

La question Kurde existe et continuera à exister, malgré tout, jusqu'à l'extermination du dernier Kurde, ou à l'affranchissement complet de cette nation séculaire de la tyrannie, des massacres et de l'esclavage. Le but do

لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکە بە فەرەنسی

بڵاوکراوەی

جفاتا وەلاتیێ کوردا

(خۆیبوون)

ژمارە ٢

# قەتڵوعامی کورد

# لە تورکیا

قاهیرە

چاپخانەی پۆل-باربی

١٩٢٨

وەرگێڕانی دەقاودەقی سەر بەرگی کتێبە فرانسییەکە

# پێش ئاگربەس

کێشەی کورد، قەتڵوعامی خوێناوی دەستەجەمعیی کورد، ئەو پرسیارگەلەن کە بە بەرچاوی دونیای شارستانیخوازدا تێپەر دەبی لەناو ئەو ڕووداوانەی ڕۆژانەدا کە سەرنجیان قۆرغ دەکات، بەتایبەت لە سۆنگەی هەنگاوی توندوتۆڵ و سانسۆری زۆر سەختدا کە تورکەکان پێڕەوی دەکەن بۆ داپۆشینی تاوانەکانیان، کەس ئاوڕیان لێ نادات‌ەوە.

ئێمە کە باس لە جیهانی شارستانی دەکەین، ئەوە زیاتر مەبەست لە نەتەوەکانە، نەوەکا حکوومەتەکان، کە دەمانەوێ ناویان ببەین. چونکە ئەوە هیچ گومانی تێدا نییە کە هێزە گەورە ماندایتێرەکان لەسەر سنوورەکانی گۆڕەپانی قەتڵوعامەکان جێگیر بوون، ئەوانە بێگومان لە وردو درشتی ئەم تاوانانە ئاگادارن. ڕۆژ نییە چەند کوردێك، ئەوانەی کە شانسی ئەوەیان هەیە سەری خۆیان لەدەست تەوری تورك ڕزگار بکەن، خۆیان نەگەیەننە وڵاتانی دراوسێ و لەسەر سنوورەکان، بۆ ئەوەی ڕێگەی چوونە ژوورەوەیان بدەن، بەدبەختی و سیاچارەیی نیشتمانیی خۆیان نەگێڕنەوە.

بەڵام پرسی کورد هەیە و بەردەوامیش وێڕای هەموو شتێك، تا ڕیشەکێشکردنی دواین کورد، یا ئازادبوونی سەرلەبەری ئەم نەتەوە کەوناراییە لە دەست ملهوڕی، ڕەشەکوژی و کۆیلەگەری هەر

دەمینێتەوە. ئامانجی ئەم نووسراوە بریتییە لە بەرچاوخستنی کورتەیەکی مێژوویی پرسی کورد کە دەیانەوێ بە ئاگر و ئاسن بیخنکێنن، هەروەها بەشوێنداچوونی ئەو ڕووداوانەی کە لە بنچینەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ نەتەوەی کورد مەحکووم بە مەرگ دەکەن.

ئێمە بەم کارە دەمانەوێ بۆ هەتا هەتایە مافی ئەم نەتەوەیە بۆ ژیان سەقامگیر بکەین و پەردە لەسەر هۆکارە ڕاستەقینەکان و بەربەرییەکان و خۆپەرستیەکانی ئەم قەتڵوعامانە هەڵبدەینەوە.

جاڕدانی مەشرووتە لە ساڵی ١٩٠٨دا کە واپێدەچوو لەسەر داڕووخان دووبارە ژیان بکاتەوە بە بەری ئیمپراتۆریای عوسمانیدا و هێزێکی زیندوو بە پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا ببەخشێتەوە، ئەنجامەکەی ئەوەبوو کۆمیتەی ئیتحاد و تەرەقی دەسەڵات حکوومەتی گرتە دەست. تورکە-لاوەکان بە ناوی ڕزگارییەوە، بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی وڵات ئاڕاستەی ئەم دەزگا شل و شۆقەیان گرتە بندەست.

ئەم داروودەستەیە، لەوەدا بوو بتوانێ بۆ ماوەیەکی کورت ڕەوتی ڕووداوە جیهانییەکان بوەستێنێ و بە بەڵێن و پرۆگرامی دووبارە ڕێکخستنەوەی ناوەوە و دەرەوە، بەدوای خۆیەوە رایان بکێشێ.
ئەوروپا بۆ ماوەیەک متمانەی بە ڕاستبێژیی ئەم گفت و بەڵێنە دووبارە ژیان بەخشە نیشان دا.

لە ناوەوە گفت و بەڵێنەکانی یەکسانی، ئازادییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، بەبێ جیاوازیکردنی ڕەگەز یان ئایین، بوون بە سایەی زۆر ئاشتبوونەوە و ڕق و ناکۆکییە کۆنەکان بە تەواوی فەرامۆش کران.

ڕای گشتیی جیهانی بۆ ماوەیەك باوەڕی بەوە هێنا کە ڕەگەزی مەنگۆل حکوومەتێکی شارستانیی پێشکەش بە جیهان دەکا. بەڵام ئەم ئاخاوتنانەی تۆرانیەکان کە لە بەرگی شارستانیخوازیدا خۆیان مەڵاس دابوو، لە ڕاستیدا پرۆژەیەکی لە هەموان بەربەریانەتر و خوێناویتریان ئامادە دەکرد.

تورکە-لاوەکان توخمێکی نوێ: "ناسیۆنالیزم"یان خستە وڵاتەوە. وەك دەڵێن تورکە-لاوەکان دەیانەویست وەك شۆڕشگێڕە گەورەکانی ئەورووپا: چیتر گوێیان نە لە باسکردنی دەستووری سیاسیی کۆنی ئیمپراتۆریا: عوسمانیزم و نە لە سیاسەتی پان ئیسلامیزمی سوڵتان عەبدولحەمید بێت، ئەوان دەیانەویست بە سیاسەتی ناسیۆنالیزمی تورك جێگەیان بگرنەوە.

لەولای دیکەوە عوسمانیزم و پان-ئیسلامیزم بۆ خۆیان هیچ ئامانجێك دیکەیان نەبوو. جگە لە بە کۆیلەکردنی ڕەگەزە ناتورکە موسڵمانەکان و غەیرە موسڵمانەکان- بەرامبەر بە ڕەگەزی تورك. ئیمپراتۆریای عوسمانی لەوەتای دامەزراندنییەوە تا دوایین ڕۆژەکانی عەبدولحەمید، هەموو سیاسەتی ئیمپراتۆریانەی. بە تەنزیمات و خەتی هومایۆنیشیەوە. تەنها ئامانجی کۆیلەکردنی ڕەگەزەکانی دیکە بوو لەبەرامبەر ڕەگەزی تورکدا و ئەم ئیمپراتۆریایە تەنها ئیمپراتۆریای ڕیاکاری و چاوبەستەگی بوو. هەموو ئەو جاڕدان و دووپاتکردنەوانەی کە لەو ڕێگەیەوە ئەوەیان زامن دەکرد بەرژەوەندی هەموو ڕەعیەتگەلی ئیمپراتۆریا بەبێ جیاوازی ڕەگەز یا ئایین زامن و پارێزراوە، تەنها قسەی سەرنجڕاکێش بوون، کە مەبەست لێیان شاردنەوەی بەدبەختیی ڕەگەزەکانی دیکەی ئیمپراتۆریا بوو لەبەر چاوی جیهانی شارستانیخوازدا.

نەتەوەی کورد، ئەو نەتەوەیەیە کە لە هەموان زیاتر گیرۆدەی دەستی ئەم ڕەوشە بوو و بە شێوەیەکی زۆر سەراسیمە ڕووتاندوویانەتەوە.

تورکە-لاوەکان بانگەشەی گەنجکردنەوەی ئەم ئیمپراتۆریا پیرەیان دەکرد، بەوەی وا وڵاتێکی مۆدێرنی لێ دروست بکەن. بۆ ئەمە وایان پێ باش بوو کە پێویستە دۆگمی کۆنیی عوسمانیزم و پان-ئیسلامیزم بخەنە جێی ناسیۆنالیزم. بەڵام بەدبەختیەکەی ئەوەبوو کە تورکە-لاوەکان بە هیچ کلۆجێ لە ناسیۆنالیزم نەگەیشتن بەو ئاراستەیەی کە جیهانی شارستانی تێیگەیشتبوو و پێڕەوی دەکرد. تورکە-لاوەکان دەیانەویست تورکیایەك دروست بکەن کە ناتورکەکان، لە باکوورەوە بۆ باشوور و لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای ئەم دەوڵەتە، هیچ شوێنێکیان بۆ ژیان تێدا نەبێ و بیانخنکێنن.

بۆ ئەمە ڕێگەی پراتیکی بەبێ کێشەیان دۆزییەوە:

ڕەگەزە ناتورکەکانی ئیمپراتۆریا، ئەوانەی زۆر کێشەیان نییە، تورکیزە بکرێن و ئەوانی دیکەش قەڵاچۆ بکرێن.

ئەم بنچینەیەی سیاسەتی نیشتمانی کە لە لایەن تورکە-لاوەکانەوە دامەزرا، هێندە پێویستی نە بە کات، نە بە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەی گەورە نەبوو بۆ ئەوەی لە لایەن هەموو تورکەکانەوە پەسند بکرێ. هەموو تورکێك لە ماوەیەکی کەمدا ئەم پرەنسیپانەی کرد بە ئینجیلی سیاسەتی نیشتمانیی خۆی.

ڕەگەزە پێکەوەبەند و ناتورکەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی بریتین لە: عەرەب، ئەرمەنی، ئەلبانی، یۆنانی، چەرکەس و کورد.

تواندنەوە و ڕیشەکێشکردن دەبێ بە لەبەرچاوگرتنی باوەڕیان بەسەر ئەم ڕەگەزانە دا پیادە بکرێ. ڕەگەزە ناتورکە موسڵمانەکان

تواندنەوەیان ڕاگیرا. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ دەرفەتی ئەو پێوەندییە ئابینیانە بقۆزرێتەوە کە لە نێوان ئەم ڕەگەزانە و تورکەکانا هەیە. ناتوانرێ بە تەواوی بیر لە تواندنەوەی ڕەگەزە نا موسڵمانەکان بکرێتەوە، چونکە فەناتیزمی ئایینی هەر دوو لا ئەم شیمانەیە دەردەها وێژێ. کەوایە تەنها ئەوە ماوەتەوە کە قەلاچۆکردن بەسەر ئەم ڕەگەزانەدا پیادە بکرێ.

ئێمە بە کورتی پرۆژەی تواندنەوە و قەلاچۆکردنی تورکە – لاوەکان بۆ هەموو ئەم ڕگەزانە دەخەینە ڕوو.

عەرەب: هەرچەندە موسڵمانن بەلام تواندنەوەی عەرەب لە لایەن تورک ئەو هێندەی تواندنەوەی ڕەگەزە مەسیحییەکان سەخت بوو. دروستکەری شارستانی لە ڕۆژهەلات، خاوەن مێژوویێکی پڕ لە داگیرکردن. عەرەب، ڕۆمان و زمانەکەشیان زمانی لاتینی ڕۆژهەلاتە.

تورک لەخوارتر، هەتا گەلێك لە عەرەب خوارتربوون، لە مێژوو، زمان، زانست و ئەدەبیات دا. ئیمپراتۆریای شەش سەدەی تورک تەنها بە شارستانیەتی عەرەب، زمانی عەرەبی. یاسای عەرەبی. کولتووری عەرەبی دروستبوو و بەڕێوەبردرا. ئیمپراتۆریای عوسمانی هەرگیز نەیتوانیوە لە سنوورەکانی لاساییکردنەوەیەکی ساختەی عەرەبی بچێتە دەرەوە.

کەوایە نابێ بەهیچ شێوەیەك بیر لە تواندنەوەی ئەم ڕەگەزە بکرێتەوە. تەنها قەلاچۆکردنیان لەبەردەمدا مابۆوە بەلام ئەم گریمانەیەش بەهۆی ژمارە و ژیانی پێکەوەبەندیی عەرەبەکان بۆ خۆی کێشە بوو. ئەو دەم بڕیاریان وەرگرت وەبەریان بهێنن و هەرچی دەکرێ بەکاریان بهێنن و لەکاتی پێویستیشدا خۆیان لێ

ڕزگار بکەن بەوەی وڵاتە عەرەبییەکان لە ئیمپراتۆریا جیا بکەنەوە.،
بەڵام هەرگیز بەچاوی یەکسان لەگەڵ تورکەکان سەیریان نەکەن، ئەم سیاسەتە تا کۆتایی پیادەکرا.

ئەرمەن: ئەم نەتەوە جەسوور بەڵام بەدبەختە لە سەرتۆپی لیستی ئەو نەتەوانە بوو کە دەبوو قەڵاچۆبکرێن. ئەو وەحشەتگەرییە بەربەریانەی کە ئەم بڕیارەی تێدا جێبەجێ کرا بە ئاشکرا لە هەموو دونیا ناسراوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئەوە دووپات دەکەینەوە کە هەتا چاپکراوە ئەرمەنیەکانیش هەرگیز سەرکەوتوو نەبوون لەوەی نەخشەیەکی تەواوی ئەم کارەساتە بەدەستەوە بدەن. ئێمە بەهیچ کلۆجێ بانگاشەی ئەوە ناکەین کە ئێمە ئەم هەوڵەمان داوە.، ئێرە شوێنی باسکردنی ئەمە نابێتەوە. ئێمە لێرەدا هەموو هاوسۆزییەکمان لەگەڵ ئەم نەتەوە جەسوور و دەستە خوشکەی نەتەوەی خۆمان ڕادەگەیەنین و هیوای ئەوە دەخوازین کە هاریکارییەکی بەرفراوان کۆیان بکاتەوە هەر هیچ نەبێت لە دواڕۆژ بۆ خەبات دژ بە مافی زەوتکاران و مرۆکوژەکان کە بۆ هەردوو نەتەوە هەر یەکن.

ئەلبانی: تورک پێشتر دەستیان بە جێبەجێکردنی پلانی خۆیان کردبوو دژ بەوانە، وەختایەک جەنگی باڵقان بەماناگانەوە هات و لە حاکمییەتی تورک ڕزگاری کردن.

یۆنانی: هەرچەندە لە ئەرمەنییەکان کەمتر هاوبەندن، یۆنانییەکان ئەوانیش لەسەر لیستی ڕەشی ئەو نەتەوانەن کە دەبێ ڕیشەکێش بکرێن. ئەو هەست و سۆزەی کە لەگەڵ قەتڵوعامی ئەرمەنییەکاندا پەیدابوو، تورکەکانی ناچارکرد زۆر وریایانەتر هەڵسوکەوت بکەن.

تورکەکان یۆنانییەکانیان بە زەبری شمشێر خستە لایەکەوە، لە چاوەڕوانی ئەوەدا کە لە نزیکترین دەرفەتدا بە دەستەجەمعی قەڵاچۆیان بکەن. پەیماننامەی لۆزان جەلادانی قوربانییەکان و قوربانی جەلادەکانیان ڕزگار کرد. ئەو یۆنانیانەی کە لە تورکیا مانەوە، تووڕیان دانە ئەودیوو سنوورەکان.

چەرکەس: ئەو نەتەوەی کە بەگوێرەی سەدەکان سیمای تەتەری ڕەگەزی مەنگۆلی شارستانیی جوانکردووە، لیستی تواندنەوە بوون. چەرکەسیانی نیشتەجێی تورکیا هەرگیز لە بنچینەدا نیشتەجێی ئەو وڵاتە نەبوون کە تێیدا دەژیان. ئەوانە پەناهەندەی قەوقاز بوون کە بە هەموو لایەکی تورکیادا پەرت و بڵاو بووبوونەوە. ئێمە دەبێ بۆ دادوەری و بۆ مێژوو ئەوە بڵێین کە ئەم نەتەوە چاکە بەهیچ شێوەیەك بۆ بەرژەوەندی تایبەتیی خۆی لە زێدی خۆی هەڵنەقەتراون. بەڵکوو ناچارکراوە و تێوەگلاون بەو هۆیەوە کە چارەنووسی خۆی بە تورکەوە بەستبۆوە دژی دوژمن و ئەرکی بەرگریکردن لە سنوورەکانی تورکی لەئەستۆ گرتبوو. کەوابوو پەناهەندە چەرکەسییەکان قوربانیی دەستی وەفادارێی خۆیان بوون لە بەرامبەر تورکدا کە بە کوشتوبڕ و تواندنەوە قەرەبوویان بۆ کردنەوە.

کورد: نەتەوەیەك کە لە هەموان زیاتر تورك چاوی تێبڕیبوو بۆ تواندنەوە، نەتەوەی کورد بوو. نەتەوەیەکی گەورەی موسڵمان کە لەوەتای ٤٠٠ ساڵەی حاکمییەتی تورك نوقمی ناو نەزانیی کردووە. لەکاتی ملکەچبوونی خۆویستانەیدا بۆ یەکەم خەلیفەی تورك، سەلیمی یەکەم، لەگەڵ شەرت و مەرجی تایبەتدا بۆ پاراستنی تەواوی داوودەزگەکانی و سەربەخۆییەکەی، کوردستان لە ١١

دەوڵەتی تەواو سەربەخۆ پێکهاتبوو. نەتەوەی کورد تەنها لەبەر هەستی ئایینی هاتە ژێر ئەم بارە.

شایانی گوتنە، کوردستان لەکاتی ملکەچبوونیدا بۆ سەلیمی یەکەم بەر لە چوار سەدە، خۆشگوزەرانی و ئاوەدانییەکەی لەگەڵ ئەو کولەمەرگی و نەزانییەی کە ئەمڕۆ تێیاندا نوقم بووە، بەراورد ناکرێن.

نەتەوەی کورد کە ئەوکاتە و ناسراوبوو شارستانیەتێکی پێشکەوتوو، داو دەزگەی زانستی، پیشەسازی، ئابووری و هی دیکەی هەبوو، بەرەبەرە گەورەیی خۆی لەدەست دا و کەوتە ناو شەوی تاریک. تورک چوار سەدە دەبێ پێی ناوەتە ناو خاکی پیرۆزی و هەمووشتێکی تێدا کوێر کردۆتەوە. تورک لەو ڕۆژەوەی کە پێی ناوەتە ناو نیشتمانی کورد، تەنها هەر دەستدرێژیی بەربەریانە دەکات بۆ سەر زمان، ناسیۆنالیتە، کولتوور و ئایینی کورد. بۆ دابەزینی کورد بۆ ئاستی خۆی، تورک مشووری ئەوەی خوارد کە هەموو ڕێگەکانی پێشکەوتن و فێربوون لە کورد بگرێ.

دەوڵەتە کوردییەکان یەک لەدوای یەک لەناو چوون و بوون بە قوربانیی دەسیسەی تورک و لەوکاتەی کە ساڵی ١٨٦٤ دوایەمین دەوڵەتی کوردی کە میرنشینی بۆتان بوو، کە توانیی تا ئەوکاتە بەرەنگاری بکات، دوای جەنگێکی شووم هەموو نیشتمانی کورد کەوتە ژێر دەسەڵاتدارێتیی تورک.

تورک کە بۆسەرچوو کورد بخاتە ناو نەزانییێکی تاریک و زمانی خۆی خستە ناو شارە گەورە کوردییەکان، هیوایەکی گەورەیان لەسەر ئەوە هەڵچنیبوو کە بەسەرکەوتوویی کورد و کوردستان بتوێننەوە، لە کاتێکدا تا ئەو دەمە هەروەک کۆگەیەکی سەربازی بەکاریان هێنابوو. بۆ ئەمە تەنها چاوەڕوانی دەرفەتی شیاو بوون.

جەنگی گەورە، لە رەوشێکی زۆر لەباردا، دەرفەتی چاوەڕوانکراوی هێنایە پێشەوە. ئەو کاتەی تۆپەکانی جەنگی گەورە بریسکەیان لێوە هات، تورک دەستیان بە جێبەجێکردنی ئەو پلانە کرد کە لە سەردەمی ئاشتیدا دایان ڕشتبوو. مەبەست لەوە دەست بەکار بوون گروپەکی چوار تا پێنج ملیۆن مرۆیی قودرەتمەند، ساغلەم، زیرەك و جەسوور بەبێ قەلاچۆکردنیان لەبەین ببەن و تێکەلاویان بکەن لەگەڵ ڕەگەزی تورکدا کە پێشتر ئالوودەی زەرەرو زیان، مەلاریا و دەردە باریکە... هتد بووبوون. کورد ڕووی لە لەناوچوون دەکرد و ئەم گرۆ پێنج ملیۆن کەسییە لە لایەن تورکەوە بەرەو تواندنەوە دەچوون. هەتا خەلیفە و سوڵتان محەمەد ڕەشادی پێنجەم یاسایەکی دە مادەییان لەمبارەیەوە ئیمزا کرد. بەگوێرەی ئەم یاسایە، کورد لە ماڵ و حاڵی خۆیان وەدەر دەنران و ڕەوانەی هەرێمە تورکییەکان دەکران. دەبوو ئەم کوردانە بەسەر ئاواییە تورکییەکان دابەش بکرێن، بەجۆرێك هەر ڕێژەی لە 5%ی دانیشتوانی نەسڵی پێك بهێنن.

بەگزادە، سەرۆکهۆزەکان دەبوو لەناو شارەکاندا دابنیشن و هەموو پێوەندییێك لەنێوان خۆیاندا و لەگەڵ کوردەکانی دیکەدا قەدەغەبێ.

تورکەکان بە ڕەفتارکردنیان بەمشێوەیە، بەهیوا بوون بگەنە ئەوەی بە تەواوەتی نەتەوەی کورد بسڕنەوە، بە تایبەت دوای یەك نەوە. ئەوکاتەی کە وەچەی تازە زمانی خۆیان لەدەست دەدەن. بە هەمان شێوە چالاکانە گەیشتنە ئەوەی کە نەتەوەی کورد لەناوبەرن و بیتوێننەوە و لە هەمان کاتدا جێگەی تورکە زیان پێکەوتووەکان، سیلاوییەکان بە ڕەگەزێکی نوێی ساغلەم، بەهێز و جوان، بە ڕەگەزێکی شکۆمەندی ئاری پڕ بکەنەوە.

ئەم یاسایە بەشێوەیەکی پارچەیی (جزئی) خرایەکار. تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتیی موهیاجیرەکان لە کۆنستانتینۆپل ٧٠٠٠٠٠ کوردی تۆمار کردووە کە لە ماڵ و حاڵی خۆیان هەڵکەندراون. بەڵام هەمان ئەم تۆمارانە لەبەرامبەر چارەنووسی ئەم موهاجیرانەدا متەقی لە خۆی بڕیوە. ئێمە لێرەدا تکا لە بەڕێوەبەرایەتیی موهاجیرەکان دەکەین ئەو چارەنووسە ترسناکە ئاشکرا بکات کە ئەم موهاجیرانە پێی گەیشتن.

تورک ویستیان کورد هاوشان لەگەڵ قەتڵوعامی ئەرمەنییەکاندا، دەربەدەر بکەن، بەڵام نەبوونی ئامراز و ڕێگە و ئەو لێکهەڵوەشاندنەوەیەی کە لە سۆنگەی جەنگەوە تووشی ببوون، بوون بە کۆسپ و زۆر بە ناتەواوی توانییان پلانەکەیان تەواو بکەن.

ژمارەیەکی زۆر موهاجیری کورد لە ڕێگە لە برسان، لە سەرمان و بەهۆی نەخۆشییەوە مردن، بەشێکی زۆریشیان لەژێر سەرەنێزە و تەوری نەفسەر، ژەندرمە و کۆمیتەکانی تورکدا لەناو چوون.

ئەوانەی لەکاتی جەنگدا بە چیای تۆرۆسدا تێپەڕیون، دەبێ ئەوە گەرە لاشەی مرۆڤانەیان وەبیربێتەوە کە یەک لەسەر یەکتر کەڵەکە کرابوون. ئەوانە ئەو موهاجیرە کوردانە بوون کە بە کۆمەڵ مردبوون، قوربانیی برسێتی، کولەمەرگی و نەخۆشی بوون. ئەوانەی کە لەم دەورانەدا بە مووسڵدا تێپەڕیون دەبێ ئەوەیان وەبیربێ کە گارییەکانی* شارەوانی ڕۆژانە بیست تا پەنجا لاشەی کوردیان دەگواستەوە.

کوردە موهاجیرەکانی مووسڵ لە لایەن ئەو کارمەندە تورکانەوە ڕێبەری دەکران کە لە ئەنجامی تێکشکانی تورکەوە سەریان لێ

---

* گاری: charrette واتە عەرەبانەی دەستی

شێوابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیانەویست و هەر سووربن لەسەر ئەوەی کە پرۆگرامی نیشتمانییان جێبەجێ بکەن، بەوەفا لەمەدا بۆ پرۆپاگەندە و گاڵدانی تەشکیلاتەکانی پان-تورك.

ڕاستییەکەی ئەوانە بەم کارەیان، پێچەوانەی بەشێکی ڕێنوێنیەکان جووڵانەوە کە بۆیان هاتبوو، ئەنجامەکەی بریتیبوو لە قەتڵوعام بە زیندوویی، واتە سڕینەوەیان.

ئەفسەرانی سوپای تورك، ئەوانەی کە ویلایەتی تەبریزیان داگیر کرد بە پێشێلکردنی بێلایەنیی ئێران؛ بەو تالان و برۆیەی ناو هەموو ئەو شارانەی کە پێیاندا تێپەڕبوون، خۆیان پێ دەوڵەمەند کرد و لەسەر سینەی هێشتا خوێنداری کچانی گەنجی قەتڵوعامکراوی ئەرمەنییەکان هەمیشە لەکاتی عەیش و نۆشی خۆیاندا ئەوەیان دەوتەوە:

لەکاتی هاتنمان زۆ[*]- یەکانمان ڕیشەکێش کرد و لە گەڕانەوەشدا خۆمان لە لۆ[**][14]-یەکان ڕزگار دەکەین.

دواجار ئاگربەسی مۆدرۆس، وا پێدەچوو جاڕی کۆتایی هاتنی بەربەریەتی ئەهریمەنانەی تورك بە مرۆڤایەتی ڕابگەیەنێ و بەشێوەیەکی کاتی کۆتایی بەم وێرانکارییە بهێنێ.

---

ZO [*]

LO [**]

[14] زۆZO و لۆLO دەربڕینیەکانی ئەرمەنی وکوردین و زۆر بڵاون لەناو هەردوو زماندا و بە نزیکەیی لە تورکیادا هاووتای ناوەکانیان دەگەیەنێ.

# دوای ئاگربەس

تا ئێرە هەولمان دا تابلۆیەکی زۆر کورتی سیاسیی قەتڵوعامی رەگەزە غەیرە تورکەکان نیشان بدەین کە لە لایەن داروودەستەی ئیتیحاد و تەرەقییەوە جێبەجێ کراوە، بە ئامانجی دامەزراندنی تورکیایەکی تەواو تورک کە رێگە بۆ پێکەوەنانی ئیمپراتۆریایەکی گەورەی تۆرانی خۆشبکات.

بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی تەواومان لەبارەی رووداوەکانی ئەمڕووە هەبێ، دەبێ چاوێك بەو رووداوانە بخشێنین کە لە ماوەی ئاگر بەسدا روویان داوە. لەگەڵ مۆرکردنی ئاگربەسدا، سەرۆکی ئیتیحادییەکان لە زۆر شاری هەمەچەشنەی ئەوروپادا بە دەستی عەدالەت و جەسوورانەی ئەرمەنییەکان گەیشتن و کۆنستانتینۆپۆلیان جێهێشت و سەرۆکی دووەم پلان خۆیان شاردەوە و جڵەوی حکوومەت بە دەستی چەند کەسێك سپێردرا کە کەم و زۆر وا پێدەچوو بێلایەن بن.

دوای داگیرکردنی کۆنستانتینۆپل لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە، کوردەکان وەك هەموو رەگەزەکانی دیکەی عوسمانی بە پەرۆشەوە بوون، بە تایبەت بۆ پرنسیپەکانی سەرۆك ویلسن، خۆیان بە وەرگێڕەوەی بەوەفای هۆشیاریی نەتەوایەتی دەزانی و دەنگ و داخوازینامەی ماف سەربەخۆیی و ژیانیان بەرز کردەوە. رێکخراوە سیاسییە کوردییەکان دەرفەتی ئەوەیان بۆ رەخسا خواستەکانی هاوخەباتەکانیان بخەنە بەردەم کۆمیسێری بەرزی هاوپەیمانەکان و کۆمسیۆنی بەدواداچوونی هاوپەیمانەکان.

له هەموو لایەکەوە لە کوردستان ڕێکخراوە کوردییەکان پێکهاتن و پێوەندییان بەوەی کۆنستانتینۆپلەوە کرد.

بەڵام لە هەرێمەکانی کوردستاندا، دوور لە هەژموونی هاوپەیمانەکان، کوردەکان دوو دڵ نەبوون لەوەی وا پڕبەدەنگیان هاواری داخوازینامەی نەتەوایەتییان بکەن. دواجار وەفدێکی کوردی لەبەردەم کۆنفرەنسی ئاشتیدا لە پاریس بە ڕەسمی داوای سەربەخۆیی کوردی کرد. پەیماننامەی سیڤەر بە دروستکردنی کوردستانێکی چکۆلە و مەرجیدار وەڵامی داخوازینامەکانی کوردی دایەوە. بەڵام هەتا ئەمەش بەدی نەهات و شکستی یۆنان پەیماننامەی سیڤەری پارچە پارچە کرد و پەیماننامەکە بە سەرەنێزەی کەمالیستەکان بوو بە پارچە پەڕەیەکی کاغەز و پەیماننامەی لۆزان* شوێنی گرتەوە، ئەمانە لەو ڕووداوگەلانەن کە هێندە لەبەردەم دیدەدا ئامادەن هیچ پێویست ناکات پێیان لەسەر دابگرین.

---

* پەیماننامەی لۆزان دوای چەندین مانگ گفتوگۆ و سازشکاری، ٢٤ی تەممووزی ١٩٢٣ لە لۆزان لە نێوان تورکیا لە لایەک و بریتانیا، فەرانسا، ئیتاڵیا، بریتانیا، ژاپۆن، یۆنان، ڕۆمانیا، شانشینی سێربیا، کرواتیا، و سلۆڤانیا لە لایەکی دیکەوە مۆر کرا. پەیماننامەی لۆزان دانانی ڕەسمی بوو بە حکوومەتی ئەنقەرەدا و سنووری تورکیای نوێی دیاری کرد. پرۆسێسی گۆڕینەوەی تورک و یۆنانی دەستپێکرد (1,6 ملیۆن یۆنانیی عوسمانی لە بەرامبەر ٣٨٥٠٠٠ موسڵمانی یۆنانیدا) گۆڕدرانەوە. هاوپەیمانەکان دەستبەرداری پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و سەربەخۆیی ئەرمینیا بوون و کۆنترۆڵی هاوپەیمانەکان بەسەر دارایی و هێزی سەربازیی تورکیاوە هەڵوەشێنرانەوە. هاوکات تورکیا پەیماننامەی قارسی لەگەڵ حکوومەتی شورەویدا مۆرکرد و ڕووسیا هەموو ئەو زەوی و زارانەی کە لە ساڵی ١٨٧٨ەوە داگیری کردبوون و بە قەد پانتایی سویسرە دەبوون و بە پلەی سەرەکی جۆرجی و ئەرمەنییەکانی تێدا دەژیان، بە تورکیای دایەوە وەرگێڕ.

لە ئاگربەسەوە تا ساڵی ١٩٢٢، ناسیۆنالیستە تورکەکان ناچار بوون پلانی قەتڵوعام و تواندنەوەمان ڕابگرن. تورکیا جگە لە کورد، هیچ توخمێکی دیگەی هاوڕەگەزی غەیرە تورکی تێدا نەمایەوە.

ئەوە ڕاستە کە پلانی ئەو کردنەیەی وا چارەنووسی کوردی دیاریئەکرد، پێشتر بڕیاری لەسەر درابوو و بەشێکیشی جێبەجێ کرابوو، بەڵام مایەوە سەر ئەوەی کە لەوە بکۆڵرێتەوە ئەگەر دەبێ ئەم پلانە سەرلەبەری جێبەجێ بکرێ یا دەبێ بەگوێرەی ڕووداوەکان دەستکاری بکرێ. ئەوە لەسەر کەمالیستەکان، ئەو نیتیجادیانەی دووەم پلان پێویست بوو، کە پلانی یەکەمیان جێبەجێکردبوو، بۆ ئەوەی بڕیارێک لەو بارەیەوە دەربکەن. بە هیچ کلۆجێ دوودڵ نەبوون لەوەی ئەوە قەبووڵ بکەن کە دەستکاریکردنێك پێویستە. تواندنەوەی کورد لە ئێستەوە دەبێتە خەون و خەیاڵ. هۆشیاری نەتەوەی کورد لە خەوی قووڵی ڕادەبێتەوە: تەواو بەرز و ئەوهێندە بە دەنگی بەرز هاوار دەکات کەوا چیتر پرۆژەی تواندنەوەی خۆی لەبەردا ناگرێ. ئەم هاوارە هەتا لەژێر گومەزی ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانیی ئەنقەرەشدا دەنگی دایەوە. سەرەڕای کە ئەم ڕووداوە ناخۆشەی ئەم ئەندام پەرلەمانە ئەلبانییەی وا شەقازللەیەکی خواردبوو لەسەر ئەوەی کە وێرابووی لە پەرلەمانی عوسمانیدا بە ناوی ئەلبانییەکانەوە قسە بکات، هێشتا ئەوە لەناو یادەوەریدا زیندووە کە، ئەندام پەرلەمانێکی کورد لە ڕووی ئەندام پەرلەمانێکی تورکدا لە ئەنجومەنی نیشتمانیی ئەنقەرەدا کە وتبووی، ((هەقی قسەکردن لەسەر ئەم تریبۆنە تەنها بۆ تورکەکانە)) لە بەرزیی هەمان تریبۆنەوە هاواری کردبوو: ((من ئەوە ڕاستدەکەمەوە کە، هەقی قسەکردن لەسەر ئەم تریبۆنە هی تورك و کوردەکانە، چونکە ئەم

وڵاته هی تورك و كورده)). له چهند گفتوگۆیهكی دیكهدا كه دهرفهت بۆ ههمان ئهندام پهرلهمانی كورد هاتبووه پێشهوه، به دهنگی بهرز داوای ماڧ كوردی كردبوو. كهمالیستهكان بهرگهی ئهم هاوارانهیان گرت، بهڵام بڕیاریان وهرگرت كه بهڕاستی سیستهمهكه بگۆڕن: نهتهوهی كورد به قهتڵوعام مهحكوم كرا، تواندنهوه چیتر ڕاتیك نهبوو، دهبێ كوردهكان وهك ئهرمهنییهكان قهڵاچۆ بكرێن كه ههر به شایین لهوان جوداوازن. ئهم كوردانه كه تهنها به بهراورد لهگهڵ بۆهیمییهكان موسڵمانن"[15]، دهبێ لهناو ببرێن و بهمشێوهیه گهورهترین كۆسپ له نێوان ئهنقهره و تورانیدا بۆ ههتا ههتایه لهناودهچێ.

دوای به تورككردنی ئارارات، توركهكان بههیوای ئهوه بوون دهستی ئالیكاری بۆ دانیشتوانه توركهكانی ههرێمهكانی تهبرێز له ئێران ڕابكێشن و ههرگیز لهوه دا نائومێد نهبوون كه دواڕۆژ لهوێش لهشكركێشییهك بكهنه سهر ڕهگهزی فارس.

ئهم خاڵه ههتا پێشتر سهرهتاكهی دهستپێكرابوو و سهرۆكی سوپای لهشكركێشیی تورك كه دوای پهیماننامهی برێست-لیتویسك[16] پهلاماری ئازهربایجانی دا، پێوهندیی به بهگزادهكانی

---

[15] پهندێكی توركییه.

[16] پهیماننامهی بریست-لیتویسك له ۳ ی ئاداری ۱۹۱۸ له نێوان حكومهتی ئاڵمان و حكومهتی ساوای بۆلشهویكدا مۆر كرا. ڕاستییهكهی له سهرهتای ساڵی ۱۹۱۷ هوه خهڵكی ڕووسیا داوای كۆتایی هاتنی جهنگیان دهكرد. ۷ی نۆڤهمبهری ۱۹۱۷ ترۆتسكی، وهك كۆمیسێری كاروباری دهرهوهی گهلان داوای له هاوپهیمانهكان و ئهڵمانیا كرد پهیماننامهیهكی ئاشتی مۆر بكهن. بۆ ئهڵمانیا مۆركردنی پهیماننامهیهكی ئاشتی مانای ئهوهبوو ههموو هێزهكانی خۆی له بهرهی ڕۆژئاوا چڕ بكاتهوه. ۹ی كانوونی یهكهمی ۱۹۱۷ مقاوهزه له نێوان ئهڵمانیا و بۆلشهویك دا دهستیپێكرد، بهڵام بۆلشهویك ههرگیز به مهرجهكانی ئهڵمانیا ڕازی نهبوو. دواتر پاش هێرشی ئاڵمان بۆ سهر ڕووسیا، ڕووسهكان

ولاتەوە کردبوو و لە هاریکاریکردنی ئەوان-دژ بە ئێرانییەکان- بۆ دواڕۆژ، بۆ ئەوکاتەی مەبەست کردنەوەی ڕێگەی تۆران بێت بەناو ئێراندا، دڵنیا کرابۆوە.

هیچ شتێك نەبوو بەرامبەر بە عەبقەریەتی شەڕخوازانەی تورك بوەستێ. تورکیا بەشێوەیەکی تایبەت لە سایەی شوێنە جوگرافیەکەیەوە هەر سەدەیەك بەفریای دەکەوت، هەتا لە لایەن دوژمنە کۆنەکانی خۆشییەوە. سیاسەتی لە ڕیشەدەرکێشانی ڕەگەزی کورد، دوای ئەوەی هەموو ئەو قۆناغانەی بڕی و دەستپێکی جێبەجێکردنەی هات، ئەمڕۆ شێوەیەکی سیستماتیکی بەخۆیەوە گرتووە.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، ئێمە ئەوە زیاد دەکەین کە تورك سەرمەست بە پەیماننامەی لۆزان، وایان هەست دەکرد سەرداری هەموو جیهانن و تەنها ئەوەیان مابوو کۆتایی بە پاکتاوکردنی ڕەگەزە ناتورکەکانی ئەودیوو سنوورەکانیاندا بهێنن. بەلام پێش ئەوەی دەست بە قەتلوعامی کوردەکان بکەن، تورکیا خۆی لەوەدا دەبینییەوە بە ناچاری کێشەیەکی گرینگ چارەسەر بکات کە بەدەستییەوە گیرۆدە بوو، ئەویش کێشەی ویلایەتی مووسڵ بوو، کە زۆر بە بەرفراوانی پێوەندیی بە قەتلوعامی کوردەوە هەبوو. تورکیا لەوە دەترسا بەرەو ڕووی بەرەنگاریێکی سەرسەختانەی کورد

---

ناچار بوون مەرجەکانی ئاڵمان قەبووڵ بکەن و پەیماننامەکە لە ٣ی ئاداردا مۆر بکەن. بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە بەشێکی بەرفراوانی خاکی ڕووسیا: ئۆکرانیا، بیلۆ ڕووسیا، وڵاتانی بەلتیق و پۆلۆنیا بە ئەڵمانیاوە لکێنران و دەبوو ڕووسیا قەرەبووی ٩٤ تەن زێڕ بۆ ئەڵمانیا بکاتەوە. لەگەڵ دەستپێکی شۆڕشی ئەڵمانی و ئاگربەسی ١١ی نۆڤەمبەری ١٩١٩دا، پەیماننامەکە بە تەواوی بێ کەڵك بوو و دواتر لە ماوەی جەنگی ناوخۆیی ڕووسیادا، سوپای سوور ئۆکرانیا و بیلۆ ڕووسیای ڕزگار کرد. وەرگێڕ.

بیتەوە، کاتی جێبەجێکردنی قەتڵوعام و پێش ئەوەی دەستپێبکات دەیەویست هەموو دەرفەتێك بۆ بەهاناوە هاتنی کوردەکان لەدەوەڕا نەهێڵێ. بێلایەنیی فرانسا پێشتر لە ڕێگەی پەیماننامەیەکەوە[*] کە لە ئەنقەرە مۆرکرابوو، زامنکرابوو. هیچ جێگەی گومان نەبوو کە لایەنەکەی دیکە هەرکێیەك بێت، فرانسا ڕێز

---

[*] مەبەست لەم پەیماننامەیە، پەیماننامەی فرانکلین-بۆیۆن-ە، کە پەیماننامەی ئەنقەرەشی پێدەڵێن. فرانسا دوای ئەوەی نەیتوانی لە پەیماننامەی سیڤەر دا بەرژەوەندییە کۆلۆنیالیەکانی خۆی وەکوو پێویست بپارێزێ، بۆیە هەر لە مانگی دیسامبەری ۱۹۲۰وە، ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز لەناو پەرلەمانی فرانسادا دژی پەیماننامەی سیڤەر دروست بوو و چەندین جار قسەکەری Chappedelaine لەناو هۆڵی پەرلەماندا داوای کرد فرانسا بە ڕەسمی واز لە پەیماننامەی سیڤەر بهێنێ و لە حکوومەتی ئەنقەرە نزیك بکەوێتەوە. فەرەنسا بۆ ئەوەی باشتر شوێن پێی خۆی لە سووریا قایم بکات، لە سیلیس کشایەوە و لە مستەفا کەمال نزیك بۆوە. فرانسا هەرگیز بەوە ڕازی نەبوو بریتانیا بەگوێرەی پەیماننامەی سان ڕیمۆ بەشی گەورەی دەستکەوتەکان بۆ خۆی ببات ڕووداوەکانی دوای پەیماننامەی سیڤەر. شکستی داشناك و سەرکەوتنی سوپای سوور بە تەواوی لە قەوقاز و زەریای ڕەش، ڕەوتی ڕووداوەکانیان گۆڕی و گۆڕێنکی گەورەیان لە پەیماننامەی سیڤەر وەشاند و دواتریش سەرکەوتنی مستەفا کەمال بەسەر یۆنانییەکان لەسەرەتای ساڵی ۱۹۲۱ ئیتالیا و فرانسای بەتەواوی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە بەتەواوی لە پەیماننامەی سیڤەر بکشێنەوە. دوای شکستی کۆنگرەی لەندەن، فرانسا ویستی بە تەنیا لە مستەفا کەمال نزیك بێتەوە. فرانکلین-بۆیۆن لە ئەنقەرە دەرگەی وتووێژی لەگەڵ کەمالییەکاندا کردەوە. ۲۰ی ئۆکتۆبەری ۱۹۲۱ پەیماننامەی ئاشتیی فرانکۆ-تورك لە نێوان فراکلین-بۆیۆن و یووسف کەمال بەگی وەزیری هەندەرانی حکوومەتی مستەفا کەمالدا مۆر کرا. بەگوێرەی ئەم ڕێککەوتنامەیە هەردوو وڵات حاڵەتی شەڕ ڕادەگرن و فرانسا بە تەواوی دەستبەرداری پەیماننامەی سیڤەر دەبێ و ئەمە یەکەم گورزی گەورە بوو بەر "کێشەی کورد" کەوت. بۆ زانیاریی بەدارێنتر لەمبارەیەوە، بڕوانە:

Najat Abdulla-Ali, Empire, *frontière et tribu*, *Le Kurdistan et le conflit de frontière turco-persan (1843-1932)*, Université de Paris X, Paris, 2006, pp.452-456.

له نیمزای خۆی دەگریّ. بەشیّوەیەك سنووری سووریا بۆ هەموو ئالیکاریێك کە هەوڵبدریّ لەم لایەوە بە کورد بگات، تەواو لە کورد داخراو بوو. بەلام مادام کیشەی مووسڵ بەبیّ چارەسەر مابۆوە، هەقیان بوو مەترسیی ئەوەیان هەبیّ کە ئینگلیز ویّرای ئەوەی وا راستەوخۆ یارمەتیی کوردی نەدەدا، کەچی چاو لەو یارمەتیانە دەقووچیّنیّت کە بۆ کوردەکان دەنیّردریّن. بۆ دڵنیابوون لە سەرکەوتن دەبوو کوردەکان گۆشەگیر بکریّن، بەبیّ هاوریّ، بیّ هاوپشت، بەبیّ کۆمەگ بمیّننەوە، دەبوو زامنی دەسەلات بکریّ و قوربانیانی کورد هەر بە دەستی جەلادەکانی خۆیان لەناو ببریّن. لە هەموو جۆرە ریّگەو ئامرازیّکی بەرەنگاربوونەوە بیّبەش بکریّن، وەکوو نوغرۆبوونیّکی ناو ئۆقیانووس، هەتا بیّ ئەوەی چیلکە داریّکیش هەبیّ بۆ خۆ پیّوەگرتن.

سەردارەکانی ئەنقەرە لیّیان کۆڵییەوە و بریاریان دا. بۆ ئەوەی بتوانریّ بەبیّ زیان دەست بە ریشەکیّشکردنی کورد بکریّ، دەبوو تورکیا قوربانی بە داخوازینامەکانی تورك بدات لەسەر مووسڵ، بە تایبەت کە بەشی زۆری دانیشتوانی ئەم هەریّمە کورد بوون، کە ئەگەر تورکیا بکاتە ئەوەی بۆ خۆیی بهیّلیّتەوە، ئەوا تەنها زیندەکاریێك بۆ خۆی پەیدا دەکات. چونکە دەبیّ ئەوکاتە ئەو دانیشتوانانەش بخاتە سەر ئەوانەی وا پیّشتر بۆ قەتلّوعام دانراون. ئەم بریارە لە لایەن ئەنقەرە جیّبەجیّ کرا. دوای بەرەنگاریێکی بە هاتو هاوار و پیّویست بۆ پاراستنی رواڵەتی کیشەی مووسڵ بەگویّرەی ئەو پلانەی کە ئەنقەرە بریاری لەسەر دابوو، چارەسەر کرا. لەمەودوا هیچ هۆیەك نەمابوو بۆ ئەوەی دوودڵ بن و دوای بخەن.

دەبێ بەهۆی تۆپخانە، چەك، شمشێر، تەور و ڕمەوە دەست بە ڕیشەکێشکردنی کورد بکرێ، ئەو کارەی وا بەبێ دواکەوتن کرا. نیشانەی جێبەجێکردن، قەدەغەکردنی تەواوەتی قسەکردن بوو بە کوردی لە کوردستان. بەگ، سەرۆکهۆز، شێخ، ئاغای کورد دەستگیر کران و لە وڵاتی خۆیان وەدەر نران. ڕووناکبیرانی کورد هەمان چارەنووسیان خرایە بەر. هەموو ئەمانە بەرەو هەرێمە تورکییەکان ڕاپێچ کران، بەڵام کەمبوون ئەوانەی گەیشتنە جێگە. کێڵگە، چیا، دارستان پڕ بوون لە لاشەی پارچەپارچەبووی شەهیدانی کورد کە شوێنی لاشەی ئەرمەنیەکانیان گرتەوە کە وا پێشتر لە لایەن ئاژەڵە کێوییەکانەوە هەڵلووشرابوون و بە لەزەتەوە خورادبوویانن.

## قەتڵوعام- شۆڕش

لەم بەشەدا دوای بە کورتی باسکردنی ڕەوشی بەسەرهاتەکانی کورد کە چەندین سەدەیە لەژێر نیری تورکدا دەناڵێنێ. پێوەندیەکانی چەوسێنەر و چەوساوە. ئێستە دەچینە سەر ڕووداوەکانی ئەمڕۆی ئێستەمان.

شۆڕشی کورد دژ بە حاکمییەتی تورك، بە قەد ئەم حاکمیەتەی تورك کۆنە. ئەم شۆڕشانە هەر شێوەیەکیان وەرگرتبێ بەگوێرەی ئەو ناوچانەی کە لێیەوە بەرپا بوون، ئامانج هەرگیز نەگۆڕاوە: ڕزگاربوون لە تۆقی ملهوڕی و سەربەخۆیی نیشتمانی بووە.

بەبێ ئەوەی هیچ گومان لەوە بکرێ کە ئەم خەباتی سەربەخۆییە ئەو ڕیکلامەی بۆ نەکرابێ کە شایستەی بێ، ئەم شۆڕشانە شێوەی شکۆمەندیی مێژووی نیشتمانپەروەریان بەخۆوە گرتووە. بەڵام ئەم

خەباتە قارەمانانەیە بە هیچ شێوەیەك نەگەیشتۆتە دەرەوە، یان گەیشتووە، بەڵام هێندە شێوێندراوە کە جیهان بە هیچ شێوەیەك لە پیرۆزیی ئەم خەباتە حاڵی نابێت. دێرسیم کە چوار سەدە دەبێ هەرگیز چەکی دانەناوە، نموونەیەکی درەوشاوەی بەردەوامی نیشتمانپەروەریی کوردمان دەداتێ.

ئەو خەباتەی کە لە ماوەی هەشت مانگدا لە لایەن ڕێبەرانی بوهتانەوە دژی سوڵتان عەبدولمەجید پشتگیریی لێوە کرا، شکستی خوێناوی کە فەیلەقی یەکەمی لەشکرکێشیی تورك چەشتی، ئەم لاپەڕەی شانازی و خۆڕاگرییە هەمووی بە نەناسراوی ماوەتەوە، وێڕای ئەوەی کە تورك ئەم شەڕانەیان تا هەتا هەتایە بە "میدالیای کوردستان" کە دروستیان کردووە. یاداشت کردووە ئەگەر بمانەوێ چەند بارە نموونەی ئەو جەنگ و شۆڕشانە بهێنینیەوە کە لە لایەن کوردەکانەوە دژی تورك کراون، ئەوا ئەم نووسراوە بەش ناکات، چونکە دەتوانین ناوی هەزارانیان بژمێرین.

بەڵام ئەوە بۆ کورد زۆر سەختە کە تورکەکان تا ڕادەیەك لە دەرەوە توانیویانە هەموو خەباتی ئازادیخوازی کورد بۆ ڕای گشتیی جیهانی، وەك کردەی چەتەگەری و هەموو ئەو پاڵەوانانەی کە لە گۆڕەپانی شانازیدا کوژران وەکوو ڕێگر بناسێنێ. برێنەجار زۆر لەوەش زیاتر ڕۆیشتوون. بەڵکوو کوردیان بە قەتڵوعامی ئەرمەنییەکان گوناهبار کردووە. ئەو قەتڵوعامەی کە لە لایەن سیاسەتوانەکانەوە بیری لێکرایەوە و لێی وردبوونەتەوە و لە لایەن عەسکەری تورکیشەوە جێبەجێ کراوە.

ئەگەر بەرێکەوتیش دەنگێك بەرز بێتەوە بۆ ئەوەی داکۆکی لە کورد بکات، ئەوا بێشەرمیی تورك دێت و ئەوە دووپات دەکاتەوە

کە کورد موسڵمانن و بەتەواوەتی تورکن و لەگەڵ تورک یەك یەکەی لێك جیانەکراوەن. هەتا یەکێك لە هەرە کۆنە دیپلۆماتەکانی تورك، وەزیرێکی زۆر کۆنی هەندەران و سەرەك وەزیر، لەبەردەم کۆنفرەنسی ئاشتیدا پاشەکشەی لەوە نەکرد کە کوردەکان بکەری بەرپرسیاری هەموو قەتڵوعامی: کۆن و نوێی ئەرمەنییەکان بن. ئایا ئەدەبوو ئەم کۆنە دیپلۆماتەی عوسمانی، ئەوی نەتەوەیەك هەتك دەکات کە وەك نەتەوەی برا ناوی ناوە، لەماوەی هەموو ئەم کاروبارانەی نیو سەدەی دواییدا؟

کۆماری ئەمڕۆی تورکیا، ئیمپراتۆریای عوسمانیی دوێنێ، هەر چەشنە شێوەیەکی حکوومیی تورکیی دواڕۆژ، هەمیشە لەگەڵ ئەوەدان کە هەرگیز شوێنێك بۆ کورد لەبەر خۆرەتاو دیاری نەکەن.

باوەڕکردوو بەم ڕاستییە، بە ئەزموونی چوار سەدە و بە خوێنی ڕژێنراوی سەدان هەزار قوربانی، کورد تەنها خوازیاری حکوومەتێکی نیشتمانییە و بە تووڕەییەوە هەموو حکوومەتێکی تورکی ڕەتدەکاتەوە!

هەموو ئەم فۆرمانە لە بنەواندا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕن و هەر وەك خۆی دەیهێڵنەوە: کورد نابێ شوێنێکی لەبەر خۆرەتاو هەبێ... بە هەموو ئامرازو ڕێگەیەك، بە کوشتن و بوختانیش بێ هەر دەبێ لێی بێبەش بکرێ. تورك لەمەدا وەفادار بۆ سیستمی خۆی، بە هەمان شێوە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ یش دەشێوێنێ کاتێك پێی دەڵێ "ڕاپەڕینی چەکدارانەی شێخ سەعید". ئێمە لێرەدا بەمبۆنەیەوە ئەم مومارەسە دووڕوووانەیان. چەکی کۆنینەیان کە ڕیاکارییە، دەخەینە بەرچاو.

کۆنووسی دادگە کاتی ئیستیقلالی تورک، مورافەعەکانی دادسەرا، مەحکوومکراوەکانی لەسێدارەدان، هەواڵنێری ڕۆژنامەکان، دواجار هەموویان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەم شۆڕشە بۆ ئیدیالی کوردستانێکی سەربەخۆ بووە.

تورک لە ئەورووپا ئەو قاوە بڵاو دەکەنەوە کە ئەمە کاردانەوەی فەناتیزمی (دەمارگیری ئایینی) کوردە کە، سەرسەختانە دەیەوێ لەناو تاریکیدا بمێنێتەوە. لەناوەوە پێیان وایە زۆر وریاترە ڕاستیی حەقیقەتی شۆڕشەکە بڵاو بکەنەوە. ئامانجی کەمالیستەکان لەم دوو یارییەدا هەڵهێنانی زۆر ئاسانە. بە بڵاوکردنەوەی حەقیقەتی شۆڕشی کورد لە بەرامبەر تورکەکان، بەر لە هەموو هاوپەیمانێتییێک لە نێوان کورد و ناڕازیانی تورکدا دەگرن، دڵنیا لەوەی کە لەبەرامبەر ڕقی کورددا، هەموو ڕقێکی دیکە نامێنێ و یەکیەتیی پیرۆزی تورک زامن دەبێ.

لەگەڵ ئەورووپادا بە پێچەوانەوە، دەبێ ڕووداوەکان بشێوێندرێن، پێیان نیشان بدرێ کە کورد وەکوو بەرهەڵستکارێکی سووک و چرووکی شارستانی وایە، خەڵکانی دەمارگیر (فەناتیک)، تالانچیی بێبەش لە هەموو ئیدیالێک، بۆ خەلیفە و خەلافەت شەڕ دەکەن. ئامانج لەمەدا: ڕێگە گرتنە لەوەی کەوا ڕای گشتیی جیهانی بیروڕایەکی تەواو ڕاست و دروستی لەبارەی کوردەوە ببێ و هاوسۆزیان بێ. هانیان بدەن و دنەیان بدەن. لەگەڵ ئەوەشدا کورد زۆر شایانی شارستانین، داب و نەریت و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی ئاری و لیبراڵن و لەگەڵ ئەوەی تورکەکاندا بەراورد ناکرێن. ئەوە تورک و دەسەڵاتی شوومی تورکە ڕێگەی لە کورد گرتووە ڕزگاری ببێ. بۆ ئەوەی بە ڕوونی تورکەکان بە درۆ بخەینەوە

و نیازی خراپیان بخەینە ڕوو، هەروەها ڕووی ڕاستەقینەی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ بەدیار بێخین، وا چەند نووسراوێکی پەیامنێرانی تایبەتی لە دیاربەکر، لە ڕۆژنامەی "وقت" ی تورکی دەقاودەق رادەگوێزینەوە.

Civilisation et Compassion Turques

[illegible] journal Wakit [illegible]

شارستانی و سۆزی تورك

***

چەند کلێشەیەکی ڕۆژنامەی "وقت"ی ڕۆژی ٢٧ ی نیسانی ١٩٢٥

خاینەکان بەرەو پەتی سێدارە ( وقت)

دیاربەکر، ٣٠ ی نیسانی ١٣٤١

## پیلانێک لە دیاربەکر

ئەو هێرشەی کە لە لایەن یاخیبووەکانەوە کرایە سەر دیاربەکر، ئەو هەوڵانەی کە لە دەرەوە و ناوەوەی دران بۆ دەستبەسەرداگرتنی شارەکە، ئەو باوەڕەی سەقامگیر کرد کە یاخیبووەکان بوونێکی زیرەکانەیان لەناو ئەم شارەدا هەیە.

ئەو نهێنانیانەی کە تا ئەمڕۆکە نەزانراو بوون، پەردەیان لەسەر لادرا. گرینگترینی ئەو نهێنیانە بریتین لە ئامانجی ڕاستەقینەی شۆڕش و کاردانەوەکانی شۆڕشەکە. پیلانێکی زۆر گەورە لە بەشێکی هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکاندا بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ دارێژرابوو. جووتیارەکان توخمی هەرە زیانبەخش بوون. جووتیارەکان زۆر بە میواندارییەوە پێشوازییان لە کۆڵۆنە سووسەکارەکانی ئێمە دەکرد و پاشان بە یاخیبووە کوردەکان کە وا پێدەچوو لە ناوماڵەکانی خۆیان شاردبیانەوە، زیندانیان دەکردن.

ئەم ڕووداوانە لە کاتی ڕۆژە هەوەڵینەکانی شۆڕشدا وابوون، چونکە تەنها ڕۆژی ٢١ی ئادار بوو کە دەبوو ڕاپەڕینێکی گشتی لەناو هەموو هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکانی وڵاتدا ببوایە بۆ پێکەوەنانی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ. کەچی شۆڕش دوو هەفتە پێشتر بەرپابوو.

شەپۆلی بیرۆکەی کوردستانی سەربەخۆ، کە لەبەردەم دیوارەکانی دیاربەکردا بەرەوڕووی بەرگریی تەواو ڕێکخراوی ئێمە بوونەوە، ئەو هەموو بەتەنگەوەهاتنەی نەبوو کە لە لایەن خاینە جوداخوازەکانەوە چاوی تێدەبڕا. سوپا کە ئامادەیی خۆی

وەرگرتبوو، هەموو گومانلێکراوەکانی زیندانیی کردن، بەمشێوەیە رێگەی لە سەرکردایەتیی زازا گرت کە، لەناوەوەی شاردا یاریدەی هێرشبەرەکانی بدات.

ناشید حەقی

***

دیاربەکر، ٢٣ ی نیسانی ١٩٢٥

## دواهەمین قۆناغی موحاکەمەی شێخ ئەیووب

مورافەعەی دادسەرا[*]:

ئەو تاوانبارەی ئێرە شێخ ئەیوب، شێخی قەرە باقچە لە سیوەرەك، سەرۆکی ئیستیقالەپێکراوی پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری لە سیوەرەك، تاوانبارە بەوەی کە دەستی لەگەڵ سەرۆکی یاخیبووەکاندا، شێخ سەعیدی پیران، تێکەڵ کردووە، بەوەی وا نێردراوی ناردووە بۆ زۆربەی هەرێمە تورکییەکان کە هاوخەباتکارە کوردەکانی تێدا دەژین. تاوانبارە بەوەی پێوەندیی لەگەڵ هێزە یاخیبووەکاندا هەبوە، *بەوەی کە بەگەڵ ئەوان کەوتووە و ئاگای لە پرسەکە هەبووە، بەوەی بۆ پرسی پارچەپارچەکردنی دەوڵەت. بۆ پارچەپارچەکردنی نیشتمان، بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ* چالاکیی کردووە.

لەبەر ئەوە تاونبار شێخ ئەیوب تاونبارە بەوەی کە ویستوویە بەشێکی نیشتمانی تورکیا جیا بکاتەوە و داوودەزگەیەکی سیاسیی سەربەخۆی لە دەرەوەی نیشتمان پێ ببەخشێ.

---

[*] دادسەرا ministère public

**بڕیارنامەی دادگە:**

دادسەرا و تاوانباری داواکراو و ئەو بەڵگەنامانەی بەردەست کە لێیان کۆڵرایەوە. پاش تاووتوێکردن. لەگەڵ ئەو بەڵگانەدا کە بە دوورودرێژی لە کۆنووسی-دانیشتنەکەدا هەن، تاوانبار شێخ محەمەد خالیدی کوڕی ئەیووب، هەروەها هەموو ئەوکەسانەی کە هاوبەشییان لەگەڵ شێخ سەعید دا کردووە، دانیان بەوەدا ناوە کە بکەری تاوانی پیلانگێڕین بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، بۆ پارچەپارچەکردنی کۆماری تورکیا و بەوەی یەکێك لە پیلانگێڕەکانی شۆڕش بووە....

دوای بەهێند گرتنی ئەو بەڵگانە و یەقینی ڕازیکەرانەی پێویست و بە ویژدانی ئاسوودەوە. بەگوێرەی مورافەعە. تاوانبار شێخ ئەیووب، بەگوێرەی بڕگەی تایبەتی یاسای سزادان، بە تێکڕایی و بە ئامادەبوونی خۆی سزای لەسێدەرادانی بەسەردا سەپێنرا.

شێخ بە خوێن ساردییەوە گوێی لەم بڕیارنامەیە بوو و بەشدارەکانیش بەگەرمی هوتافیان بۆ کێشا.

**
*

۷ی ئایاری ۱۹۲۵

**لە پرۆسەی موحاکەمەکردنی دکتۆر فوئاد بەگ-ەوە**

کردەی تاوانباریکردن لە لایەن دادسەراوە پێشکەشکرا.، فوئاد بەگ بەو پێیەی کە *پیلانیگێڕاوە و کاری بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ کردووە*، هێنرایە بەردەم دادگە.

سەرۆك.- ئێوە تاوانبارن بەوەی وا کارتان کردووە بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ و ناپاکیتان لە نیشتمان کردووە. وا بەڵگەنامەکان دەخوێنینەوە، ئاگادارین.

وەکیل[**]: دوکتۆر فوئاد بکەری تاوانی خیانەتی گەورەیە، وەك ئەوەی لەناو داواکەی مندا هاتووە.

سەرۆك.- وادەردەکەوێ کە ماوەیەکی درێژە، ئێوە هەواداری کوردستانێکی سەربەخۆن و یەکبینە کاری بۆ دەکەن. دەمەوێ باوەری ئێوە لەبارەی شێمانەی دروستبوونی کوردستانێکی سەربەخۆوە بزانم.

فوئاد بەگ.- لەخۆیەوە بەتەنیا دروست نابێ.

سەرۆك.- کەوابوو ئێوە چ بەڕێوەبەرایەتییەك داوا دەکەن، بەڕێوەبەرایەتیی ئینگلیز؟

فوئاد بەگ.- .....

سەرۆك.- لە نامەکەتدا ئێوە نوسیووتانە: ((ڕۆژانی ئەمڕۆ کە نە شەوەکانی، نە سپێدەکانی پێشبینی هیچ شتێکی باش ناکەن)) مەبەستت لەم پەرەگرافە چییە.

فوئاد بەگ.- بە مەبەستێکی تایبەتی نەمنووسیوە.

عەلی صائیب بەگ.- ئایا ئێوە کوردن؟

فوئاد بەگ.- باوکم کوردە، دایکم خەڵکی دیاربەکرە، لە چەرمقەوە هاتوون، باوکم زازایە.

عەلی صائیب بەگ.- ئایا زمانی کوردی یان تورکی کامیان باشتر دەزانی، بە کام زمانیان قسە دەکەیت و بە کامیان ژیانی خۆتان بەڕێوە دەبەن. ئایا بە کوردی بەرنامەڕێژییەکانی خۆتان دەنووسن؟

---

[**] وەکیل: procureur

فوئاد بەگ.- بە توركی دەياننووسم و توركيش چاكتر دەزانم.
عەلی صائيب بەگ .- چۆن بانگاشەی كوردبوون دەكەن. لەكاتێكدا ئێوە بە توركی قسە دەكەن و ژيانی خۆتان بە توركی بەڕێوە دەبەن؟
فوئاد بەگ.-ولاتنامەی باوكم هەرچييەك بێت. هەتا ئەگەر ڕەچەڵەكی خۆشم لەبەر چاو نەگرم، چونكە من لەناو ناوەندێكدا دەژيم كە زۆرينەی كوردە. بەرژەوەندييەكانم هاجووتی بەرژەوەندی كوردەكانن.
عەلی صائيب بەگ .- ديارەكر شارێكی توركييە، ئايا دەشێ بەرژەوەندييەكەی هاوبەرژەوەندی ئەوەی كوردەكان بێت، ئێوە درۆ دەكەن!
فوئاد بەگ.-...
عەلی صائيب بەگ .- بۆچی لێرە يانەيەكی كورديتان كردۆتەوە. نەك يانەيەكی توركی؟
فوئاد بەگ.-...
وەكيل:- پەرەگرافەكانی ((لەگەڵ فەرمانی كۆميتەكانی سەربەخۆيی كورددا لە بەغدا و مووسڵ، كە چەند مانگێكە بە جددييەوە لەوەتای كار دەكەن)) و ((پرسی كورد، ئەوەی كە تا ئێستە گاڵتەی پێ دەكەن)) كە لەناو نامەكەتدا هەن، مەبەستتان چييە؟
فوئاد بەگ.- مەبەستم لەوە ئەوەيە وەڵامی ئەو پەندە توركييە بدەمەوە كە دەڵێ: ((لە هەرجێيەك سەرەنێزەی تورك هەبێ، پرسی كورد بوونی نييە)).

### بڕيارنامەی لە سێدارەدانی فوئاد بەگ

تاوانبار، دكتۆر فوئاد، كوڕی حاجی ئيبراهيم، بەوەی كە وەك پرنسيپێكی سياسی و ئامانجی ژيانی خۆی بۆ دامەزراندنی

کوردستانێکی سەربەخۆی کردۆتە ئامانج، بەوەی وا ئالیکاریی ئەوانەی کردووە کە کار بۆ دروستکردنی شۆڕشێکی چەکدار دەکەن دژ بە یەکێتیی سیاسیی تورکیا و حکوومەتی تورکیا، تاوانبارییەکەی دووپاتکراوەتەوە، بە گوێرەی باوەڕی بێگومانیی بەردەستکەوتوو، دکتۆر فوئاد بە ئامادەبوونی خۆی و بە تێکڕایی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ درا.

تاوانبار دوودڵە لە خوێندنەوەی بڕیارنامەکە و دواتر ئەم وتە کورتەی سەرۆکی بەدوادا هات:

ئێوە ژیانی خۆتان، عەقڵی خۆتان، چالاکیی خۆتان بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ تەرخان کردووە. ئێوە و ئیدیالی ئێوە، سۆنگەی مەرگی زۆر بێگوناهان بوون. چونکە ئێوە عاقڵن، ئەنجامی کارەکانی خۆتان هەڵبگرنەوە.

**

*

١٤ی ئایاری ١٩٢٥

## لە پرۆسەی دادگاییکردنی کەمال فەوزی بەگ-وە

بڕیاری تاوانبارکردن:

ناوبراو کەمال فەوزی: خەڵکی بتلیس، ناونیشان نادیار و ئێستەکە لە زینداننیی ئیحتیاتیدایە، ئەندامی کۆمیتەی کوردیی سەربەخۆیی، تاوانبار کراوە بەوەی دەستی تێکەڵاو کردوە لەگەڵ چەند شێخێکدا کە چەکیان هەڵگرتووە بۆ سەربەخۆیی کوردستان، تاوانبارە بەوەی کە بەردەوام هۆزە گوێڕایەڵەکانی بۆ شۆڕش هانداوە.

دەبێ ئەو برووسکە شیفرەییەی ماریشال فەوزی پاشا لەمبارەیەوە بخوێنرێتەوە:

((دادگەی گەورەی سەربازیی بەرەی (جەنگ) بریاری دا بە زیندانیکردنی ئیحتیاتی ناوبراو بە کەمال فەوزی بتلیسی، ئەندامی کۆمیتەی کوردیی زاخۆ*، تا بباتە بەردەم دادگەی ئیستقلال، کە ئێستە لە تەرابزۆندایە و داوا کراوە هەروەها سەرکردایەتیی بەرەی جزیرە داوایکراوە بنێردێتە دیاربەکر، بەگوێرەی بوونی ئەو بەڵگانەی کە تاوانبارییەکەی دەسەلمێنن.

پاشان تێلێگرامی شیفرەیی سولەیمان صەبری بەگ، کۆمیسێری سنوور خوێنرایەوە.

((بەوەی کە لە لایەن سەرکردایەتی فەیلەقەوە، چاودێری چوونی کەمال فەوزی بۆ ناوایییەکانی کایای مەلازگەرد کرابوو و کە لە کۆنستانتینۆپلەوە بەو پەیامە نێردرابوو تا پرۆپاگەندە دژی حکوومەت بکات بە قازانجی سەربەخۆیی کورد...))

کەمال فەوزی بەگ.- من بە عەبدولرەحمان ئاغا-م گوت خەلیفە خراوەتە زیندان و میرنشینەکە تەریك کراوە و هەموو شتێکی لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوە

سەرۆك.- ئێ ئەوجا پاشان ئێوە پێتان گوت، دەبێ دەوڵەتی کوردستان دروست بکرێ.

کەمال فەوزی بەگ.-....

**
*

---

* Zaho

١٩ی ئایاری ١٩٢٥

موحاکەمەکردنی سەید عەبدولقادر و هاوڕێکانی

عەلی صائیب بەگ.- ئەندامەکانی یانەی کوردی کە ناوەکانیان لە تۆماردا نووسراوە کێیان لەگەڵ سەربەخۆییدا و کێیان لەگەڵ ئۆتۆنۆمیدا بوون.

سەیید محەمەد[17].- لە یانەی کوردی: ئەمین عالی بەدرخان، خەلیل ڕامی بەدرخان، کامەران بەدرخان، مەولان زادە ڕەفعەت، کەمال فەوزی، شاکر محەمەد لەگەڵ سەربەخۆییدا بوون. باوکم و سەیید شەفیق، لەگەڵ ئۆتۆنۆمیدا بوون.

ئێمە ئەو کۆدانەمان بەکار نەهێنا کە ئامادەمان کردبوون بۆ یانە کوردییەکانی وا لە هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکاندا دامەزرابوون. کوڕەکەی شێخ سەعید، عەلی ڕەزا، ڕۆژی ١٢ی کانوونی یەکەم هاتە لای ئێمە و شەو لامان مایەوە. سکرتێری یانە، زەینەددین عابدین ئاڵای داهێنا. ئاڵای عوسمانی داگیرا، ئێمە ئاڵای کوردیمان هەڵدا تا وەك خۆر بدرەوشێتەوە. ئەوەیان پێشبینی بوو. ئەمین عالی بەدرخان بە ئاشکرا دنەی شۆڕشی دەدا و دەیوت لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا دەوڵەتێك دروست دەکەین.

***

٢٠ی ئایاری ١٩٢٥

پەرلەمەنتاری ئورفە

بە ئاسیۆنالیزمی کورد تاوانبار دەکرێ

گەواهی دانی سەرنج ڕاکێشەری سەرۆکی شارەوانی ئورفە:

---

[17] کوڕی سەیید عەبدولقادرە.

موفيد بەگ (ئەندام). – مستەفا ئەفەندی،– کە هەر ئێستە ڕاپۆرتەکە خوێندرایەوە– شەیحان زادە مستەفا ئەفەندی و هاوڕێکانی ئورفە و سیرۆژ، کۆبوونەوەیەکیان لە حەڵەب کردووە و لەم کۆبوونەوەیەدا، گفتوگۆیان لەبارەی بەشداری ئەم قەزایانەیانەوە لە شۆڕشی کورد و بڵاوکردنەوەی شۆڕشدا کردووە. من ڕووی دەم دەکەمە ئێوە سەرۆکی شارەوانیی ئورفە، بەو پێیەی کە ئێوە هاونیشتمانیێکی باش، پیاوێکی ڕووناکبیرن، داوا لە ئێوە دەکەم چی لەمبارەیەوە دەزانن.

مستەفا کەمال ئەفەندی.– من زۆر دژی بزووتنەوەی کورد خەباتم کردووە. ئەو ڕاپۆرتانەی کە من دەڵێم، لە ئەنقەرە نووسراون و زۆر تایبەتن بە پرسی کورد. بەڵام من هیچم لەبارەی ئەم کۆبوونەوەیەوە نەبیستووە کە ئێوە باسی دەکەن.

داواکار: دەکرێ پێمان بڵێن چیتان لەبارەی پرسی کوردەوە نووسیوە؟

مستەفا ئەفەندی.– بە هیچ شێوەیەک ناتوانم ئەوە بڵێم کە کێ تاوانبار دەکەم وەکوو سەرۆک، داوای لێبووردن دەکەم. داوا لە ئەنقەرە بکەن.

عەلی صائیب بەگ: بۆچی دوودڵیت و بەڕاشکاوی وەڵامی پرسیارەکانی دادسەرای گشتی نادەیتەوە؟

مستەفا کەمال ئەفەندی– دەترسم.

عەلی صائیب بەگ: نهێنی و ترس بە هیچ شێوەیەک لەبەردەم دادگەی ئیستقلالدا لەئارادا نین. ئەم دادگەیە، دادگەیەکی شەرعی، سیاسی و نیشتمانییە. لێرە تەنها لە خوا و لە ویژدانی خۆت بترسە.

مستەفا کەمال ئەفەندی- ئەو کەسەی کە چەندین ساڵە لەپێناوی ناسیۆنالیزمی کورد کار دەکات، عەلی ئەفەندی سویرکی، ئەندام پەرلەمانی ئێستەی ئورفەیە. من فەرمانی ئەوەم بۆ هات کە لە ئۆرفە چاودێریی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد بکەم و ئەنقەرە لە سەرۆکەکانی ئەم بزووتنەوەیە ئاگادار بکەمەوە. کۆمیتەی ناوەندیم[18] کۆکردەوە و لەسایەی چاودێریی وردی ئێمەوە، توانیمان ئەوە بزانین کەوا عەلی ئەفەندی سەری ناسیۆنالیستی کوردە لە ئورفە. من و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ڕاپۆرتێکمان مۆر کرد و بۆ ئەنقەرەمان بەرز کردەوە. ئێمە هەروەها ئەحمەد تۆفیق بەگ یشمان دەستنیشان کرد. کەچی ڕاپۆرتەکە هیچ وەڵامێکی نەبوو. دوای دوو مانگ، ئەو کەسە بە ئاشکرا پرۆپاگەندەی کوردیی بڵاو دەکردەوە. ئێمە داوامان کرد لە وڵات دوور بخرێتەوە. ئێمە نووسیمان ئەو دەیەوێ حکوومەتێکی زازا لێرە دروست بکات. ئەوە تەنها دوای هەڵبژاردنی بوو بە وەك ئەندام پەرلەمان کە خۆی بەدیار خست. کاتی هەڵبژاردنی شارەوانی، لیستێکی لە دەست بوو و بەناو هەڵبژێرەکاندا دا دەسووڕایەوە و دنەی دەدان کورد هەڵبژێرن و هاواری بۆ دەکردن: فەرمانکاری کورد هەڵبژێرن، ئەوانەی کە مشووری ئەوەیانە حکوومەت بگرنە دەست. هیچ بایەخێك بە تورکەکان مەدەن، بەمزوانە دەوڵەتی کوردی دادەمەزرێ.

***

---

[18] کۆمیتەی ناوەندی پارتی کەمالیست لە ئورفە.

٢٥ی ئایاری ١٩٢٥

**(له نێردراوی تایبه‌تیمانه‌وه له دیاربه‌کر)**

دادگه‌ی ئیستیقلال ئه‌مڕۆ ده‌ست به پرۆسێسی دادگاییکردنی چه‌ند سه‌رەڕۆیه‌ك ده‌کات که چه‌ندین ساڵه به ناهه‌ق کار بۆ دابه‌شکردنی نیشتمان و دامه‌زراندنی کوردستان ده‌که‌ن و توانیویانه پۆستی به‌رز له‌ناو وڵاتدا بگرنه ده‌ست.

سه‌رۆك.– قسه بۆ دادسه‌رای گشتییه.

وه‌کیل:– تاوانبارانی ئاماده‌بوو بریتیین له سه‌یید عه‌بدولقادر، محه‌مه‌دی کوڕی، "نافیز"ی، یه‌کێك له سه‌رۆك هۆزه‌کانی خۆشناو، عه‌بدوڵڵا سه‌عدی ئه‌فه‌ندی، که‌مال فه‌وزی به‌تلیسی که حاله‌ته‌که‌ی به‌شێوه‌یه‌کی پارچه‌یی لێی کۆڵراوه‌ته‌وه، ئه‌وانه هه‌موویان به‌وه تاوانبارن که دروستکار و *دامه‌زرێنه‌ری ئه‌و شۆڕشانه‌ن* که وا ئاسایشی هه‌رێمه ڕۆژهه‌ڵاتییه‌کانیی وڵاتیان تێکداوه و پارچه‌پارچه‌بوونی وڵاتیان کردۆته ئارمانج. خیانه‌ته‌کانیان به چه‌ند وشه‌یه‌ك ده‌رده‌بڕم و قسه‌یان له‌سه‌ر ده‌که‌م.

ڕاسته سه‌یید عه‌بدولقادر ئه‌فه‌ندی ئه‌م ماوانه‌ی دوایی زۆر که‌م ده‌رکه‌وتووه، به‌ڵام بۆ زامنکردنی سه‌رکه‌وتنی شۆڕش کاری بۆ ئه‌وه کردووه پاراستنی هێزێکی بێگانه بۆ خۆی بباته‌وه و بتوانێ کوڕه‌که‌ی و عه‌بدوڵڵا سه‌عدی ئه‌فه‌ندی* دابمه‌زرێنێ.

نافیز ئه‌فه‌ندی، مانگێك به‌ر له شۆڕش له کۆنستانتینۆپڵه‌وه هاتووه پێوه‌ندیی پێیانه‌وه کردووه و به هه‌موو توانایه‌کییه‌وه بۆ هه‌مان مه‌به‌ست هاریکاریی کردوون.

---

* Abdallah Saadi effendi

عەلی ڕەزا کوڕی شێخ سەعید بە گەیشتنی بۆ کۆنستانتینۆپل، پێوەندیی بەو کەسانەوە کردووە کە بە هیچ شێوەیەك ماڵی سەیید عەبدولقادریان جێنەهێشتووە و هەمووشیان بڕیاری ترسناك و خیانەتکارانەیان دابوو کە کێشایەوە بۆ ئەوەی کە بەرئەنجامی تراژیدی بەدەستەوە بدات.

***

۲۹ی ئایاری ۱۹۲۵

## لەسێدارەدانی سەید عەبدولقادر
## و هاوڕێیەکانی

کەمال فەوزی، پارێزەر محەمەد تۆفیق ناسراو بە حاجی ئاختی، سەیید عەبدولقادر، سەیید محەمەد، کوێر سەعدی، خۆجا عەسکەری بەری بەیان بەرامبەر بە مزگەوتی گەورە لە سێدارە دران. خۆجا عەسکەری تا بەرەبەیان گۆرانیی سۆزاویی چڕیوە. ئەوانی دیکە شەویان بە نوێژ و قورئان خوێندنەوە بەڕێ کردووە.

خۆجا ئاختی، کاتی سەرکەوتنی بۆ بەر پەتی سێدارە هاواری کرد: بژی ئیدیالی کورد! بژی کوردستان. ئاپۆرەی خەڵکەکەش کە بەشداری لەسێدارەدانەکە بوون، بە هاوارکردنەوە وەڵامیان دایەوە "بژی کۆمار".

سەیید عەبدولقادر چەند وتەیەکی پچڕپچڕی گوت، وەك: ئێوە بە لەسێدارەدانی من کوردەکان دەورووژێنن.

**
*

٣١ی ئایاری ١٩٢٥

## دانپیانانەکانی مێجەر قاسم بەگ

قاسم بەگ.- یووسف زیا، کۆنە ئەندامی پەرلەمان کە ئەم دواییە لەسێدارە درا، ڕەشید بەگ موفتی زادەی مووش، لە ولرتۆوە هاتبوون بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردن، دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی. سبەینێیەکەی زیا بە منی وت: ((قاسم، سوێندم بۆ بخۆ، چەند شتێکت پێ دەڵێم)). من سوێندم خوارد. زیا ئەوکاتە بە منی گوت نهێنییەکم بۆ ئاشکرا دەکات و درێژەی پێدا: *((کۆمیتەیەکی سەربەخۆیی و ئازادیی کورد پێکهاتووە. تۆ پیاوێکی ڕوناکبیری. تۆ دەبێ بەشداری لەم کۆمیتەیەدا بکەیت))*. وەڵامیم دایەوە بیرۆکەی ئازادی دەمخاتە پێکەنین. ئەو پێی داگرت و تکای کرد و پێی گوتم ((کۆمیتە پشت و پەنای هەیە)). پرسیم ((لە لایەن کێوە؟))، وەڵامی دامەوە ((لە لایەن حکوومەتێکەوە)). دەمویست زیاتری لێ بزانم، ئەو ڕەتیکردەوە و وتی ((ئەوانە نهێنیی کۆمیتەن، ناتوانم بیاندرکێنم)). ئەوکاتە پێم گوت ((ئایا ئەوە ڕاستە موسڵمان بە پارەی ئینگلیز بکوژرێ)). پێی وتم ((کە لە کاتی هاتنیدا عەبدولکەریم ئەفەندیی بینیوە، ئەمەی دوایی حەز دەکات من بێمە ناو کۆمیتە، دەچێ ئەم سەرۆک و ئەو سەرۆک هۆز دەبینێ)). من ئامۆژگاریم کرد تەنها خەریکی هەڵمەتی هەڵبژاردن بێت کە بۆ ئەوە هاتووە. چووم بۆ بتلیس. لەسەر کۆنووسێکی-دانیشتن دەست لەپشتدانەکانی یووسف زیا-م تۆمارکرد. بەڵام *سێزدە کەس کە وەك ناسیۆنالیستی کورد ناویان هاتووە، نکوولییان لە ڕاستیەکە کرد. داوای تاوانبارکردنەکەی من لەسەری، تەنیا کاری نەبوو، ئەو بە سەلامەتی دەرچوو.*

*یاخیبوون ئامادە کرا. ویستیان ئایین وەکوو ڕێگەو ئامرازێک بەکار بهێنن. بەڵام ئامانج سەربەخۆیی بوو. من گوێم لێ بوو شێخ سەعید دەیگوت: کوشتنی تورکێک لە کرەی کوشتنی حەفتا گاور چاکترە.*

یووسف زیا پێی گوتم کەسایەتیی گرینگ لەناو کۆمیتەکەدا هەن. ۲۰۰۰۰۰۰ لیرەیان هەیە، ٤۰۰۰۰ چەك دەکڕن.

*ئامانجی شۆڕش بریتی‌بوو لەوەی وا لە ڕێگەی ئایینەوە و بە سوود وەرگرتن لە نەزانیی کورد، بگەنە سەربەخۆیی.*

شێخ ئیسماعیل، براکەی عەبدوللەتیف ئەوەیان بۆ دووپات کردمەوە کە گوێیان نهێنییەکانی شێخ سەعید بووە، *کە لەگەڵ ئینگلیزەکان پێوەندیی هەیە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی.*

**
*

۳ی حوزەیرانی ۱۹۲٥

## ئامادەکاری بۆ شۆڕش

دیاربەکر، ۲ی حوزەیران – دەتوانین بەمشێوەیەی خوارەوە ئەنجامی گفتوگۆیەکانی پرۆسەی موحاکەمەی شێخ سەعید و هاوڕێیەکانی کورت بکەینەوە:

*ساڵی ڕابوردوو، کۆمیتەیەکی نهێنی بۆ کاری پێکەوەنانی دەوڵەتێکی کوردی لە هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێمە دروست بوو.* کۆمیتە، بە ڕاسپێریی یووسف زیا، کە لەسێدارە درا. شێخ سەعید و بنەماڵەکەی وەکوو ئەندام قەبووڵ کرد.

*تێبینی کراوە ئەم شۆڕشە کاری کۆمیتە نهێنییەکانە کە کاریان بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکرد لە ناو هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێمە و دەیانەویست ئاینی وەکوو قەڵغانێك بەکار بهێنن.*

بەڵام شۆڕش بەر لە وادە دیاریکراوەکە تەقییەوە.

**

*

٧ی حوزەیرانی ١٩٢٥

## پرۆسەی موحاکەمەی شێخ سەعید

تاوانبار کردن نامەی شێخ سەعید و هاوڕێیەکانی:

من ئەو بەڵگەنامانە بۆ دادگە، هاوپێچ لە خوارەوە، بەرچاو دەخەم کە تایبەتن بە پرۆسەی موحاکەمە شێخ سەعیدی خنس و سی وحەوت هاوڕێکەی، کە یاخیبوون و دەستیان داوەتە چەك، *لە ڕووی ڕواڵەتییەوە بۆ پشتگیریکردنی ئاینی بووە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ بووە، هتد...*

وەکیل سورەیا بەگ بۆ مورافەعەکردنەکەی دەستی بە قسەکردن کرد:

– هەموو دونیا پێی کراوە کە لە ڕێگەی وەسیلەی جیاجیا شارەزایی لەوەدا پەیدا بکات کە شوڕشێکی چەکداری لەناو بەشێکی دیاریکراو و سنووورداری هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکانی نیشتمانی تورکدا هەڵگیرسا. *هیچ گومانێکیش لەوەدا نییە کە ئەم شۆڕشە بەرهەمی چەندین ساڵ کۆشش و پڕوپاگەندەیە کە وا لە ناوەوە و دەرەوە هەولی بۆ دەدرا وەك ئەوەی لە کرنەی تاوانبارکردنەکەدا نیشان درا. ئەم شۆڕشە دەیویست ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەك پەرنەیەك بەکار بهێنێ بۆ*

*پارچەپارچەکردنی نیشتمان. شۆڕش ئامانجی دابڕانی بەشێکی نیشتمانی تورکیا بوو کە یەك یەکەی تەواو لەیەك جیانەکراوەیە لە بەشەکانی جەستەکەیدا. هەروەها شۆڕش لێکهەڵوەشاندنەوەی یەکپارچەیی و یەکیەتیی نیشتمانیی هتد هتد، لەبەرچاو گرتبوو.*

**
*

## لە کۆنووسی وەڵامدانەوەکانی شێخ سەعید

– من لە لایەن نە هیچ کەسێك، نە هیچ پارتێکەوە هان نەدراوم تا شۆڕش بکەم. من بە خۆم شۆڕشم داڕشت و ئامادەم کرد و جێبەجێم کرد و بیرکردنەوەی خۆم و *قەناعەت و ئیدیالی خۆم ڕێبەرم بوون.*

دوای ئاخاوتنەکەم لە پیران بڕیاری جێبەجێکردنیم دا.

عەلی صائیب بەگ.– لە نامەیەکدا کە بۆ موفتیی لجێ نووسراوە، ئێوە باسی خۆشەویستیی تۆڵەسەندنەوە دەکەن.

شێخ سەعید.– من ئەم نامەیەم نەنووسیوە.

عەلی صائیب بەگ[*].– بەڵام ئیمزای ئێوەی بەسەرەوەیە.

شێخ سەعید.– هیچ نازانم.

عەلی صائیب بەگ.– ئایا یووسف زیا، کۆنە ئەندام پەرلەمانی بتلیسی کە لە سێدارە درا، سەری لە ئێوە داوە؟

شێخ سەعید.– بەڵێ. هاتبوو من ببینێ. پێی وتم ئەوان نیازی دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆیان هەیە. من داوام لێکرد کە ئەگەر ئەوان بتوانن ئازووقە دابین بکەن. وەڵامی دامەوە کە

---

[*] لە تێکستە فەرەنسییەکەدا لێرە نووسراوە عەلی سەعید بەگ Ali Said Bey ، پێم وایە ئەمەی هەڵەی چاپە و ئەوەی ئێمە نووسیومانەتەوە ڕاستەکەیەتی، وەرگێڕ.

ئەوان دەچن دەست بەسەر بتلیسدا دادەگرن و ئازووقەی پێویستی تێدایە.

**
*

٩ی حوزەیرانی ١٩٢٥

**دانپیانانەکانی مێجەر قاسم بەگ**

لوتفی موفید بەگ.- ڕێکخراوی ناوخۆی کۆمیتەی "کورد" کامە بوو؟ و لە چ کەناڵێکەوە پێوەندییەکانی دەرەوە دابین دەکران!
قاسم بەگ.- من نەگەیشتمە ناو نهێنییە تایبەتییەکانی کۆمیتە. من ئاگام لە هیچ نهێنییەکیان نییە... بەڵام دەتوانم قسەکانی خالید تان بۆ دووبارە بکەمەوە. پار، سێ ئەفسەری خەڵکی سلێمانی، تۆفیق، سالح و ئیسماعیل حەقی لە ئەرزەڕۆم کۆبوونەوە. ئیسماعیل حەقی پشووی وەرگرتبوو و لە دیاربەکرەوە بە بیانووی پشوو وەرگرتنەوە هاتبووە ئەوێ. لەوێشەوە دەچێتە ئورفە و دوای ئەوەی ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە دەچێتە حەلەب، لەوێوەوە نامەیەک دەنووسێ. خالید ئەم نامەیەی نیشانی من دا، تێیدا نوسرابوو: ((من بۆزۆ بەگم بە نەجمەددین بەگ ناساند و داوام لێکرد لقی بازرگانییەکە بپارێزێ)). من لێم پرسی بۆزۆ کێیە؟ سەرەتا ڕەتیکردەوە وەڵامم بداتەوە، بەڵام لەسەر پێداگرتنی من ئەوەی بۆ ئاشکرا کردم کە مەبەستی لە بۆزۆ کورد، نەجمەددین فەرەنسی، ئیهاد تورک و سوعاد ئینگلیزە. خالید هەروەها نامەیەکی لە بەغداوە بەدەست گەیشتبوو کە لە لایەن حەریری [حەیدەرەی]زادە ئیبراهیم نووسرابوو. لەم نامەیەدا نووسرابوو: ((من لەگەڵ سوعاد بەگ باسی ئێوەم کردووە،

پێوەندیی لەگەڵ لقی بازرگانی تاران دەکات. پاشان نووسیبوویان ((ژووری گەورەی بازرگانی. بەڕێوەبەری لقی تاران ڕایدەگەیەنێ کە ئێوە دەناسێ)).

مەبەست لە ژووری بازرگانی لەندەن بوو. کۆمیتە بە دڵنیاییەوە لە بتلیس هەبوو، چونکە زیا خۆی لەوێ بوو.

مەزهەر موفید بەگ.- کەوایە شۆڕش دوو ساڵ دەبێ لە خۆئامادەکردندایە. ئامانج چ بوو.

قاسم بەگ.- بەڵێ، ئامانج سەربەخۆیی بوو. بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش لە ڕێگەی دیپلۆماتی و ئایینییەوە کاریان بۆ دەکرد، بەلام ئامانج هەر یەك بوو.

**
*

١٠ی حوزەیرانی ١٩٢٥

## چەند ڕاستیکی مێژوویی

## لەبەردەم دادگەدا پەردەیان لەسەر هەڵدەدرێتەوە

عەلی صائیب بەگ.- شێخ سەعید ئەفەندی برێك لە هاوڕێیەکانی ئێوە دانیان بەوەدا ناوە کە ماوەیەکی درێژ ئامادەکاریتان بۆ شۆڕش کردووە و واتان دانابوو دوای ئەوەی دەبنە سەرداری دیاربەکر داوای پاراستن لە ئینگلستان بکەن.

شێخ سەعید.- نەخێر، من هیچ شتێك لەو بارەیەوە نازانم.

مێجەر قاسم بەگ.- سەرۆکی بەڕێز ئەگەر ئێوە ئیجازەم بدەن من بە ڕێك و پێکی ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە لەبارەی بنچینەکانی شۆڕشەوە دەیزانم.

سەرۆك.- فەرموو قاسم بەگ ئێوە قسە بکەن.

قاسم بەگ.- بەدرخانییەکان و سەیید عەبدولقادر کە ماوەیەکی دووروودرێژبوو لە کۆنستانتینۆپل بوون بە هەموو وەسیلەیەك پڕۆپاگەندەی کوردایەتییان دەکرد. بۆ ئەوەی زۆر بە ئاسانی ئیدیالی کوردی بڵاو بکەنەوە، عەبدولڕەزاق سەری ڕووسیای دا. لە ئەنجامی پڕۆپاگەندەی شێلگیرانە و هەوڵی بێوچانی ئەم بەڕێزانەدا لە کۆنستانتینۆپل، کۆمیتەیەکی کوردی لەدایك بوو کە ناوی ((جەمعییەتی تەعالیی کورد))[١٩] بوو. سەیید عەبدولقادر وەکوو سەرۆك هەڵبژێردرا. زۆر بە دڵنیاییەوە پێم وایە ئەم کۆمیتەیە لقی لەناو هەرێمەکاندا هەبوو. چالاکیەکانی ئەم کۆمیتەیە لەکاتی شەڕی گەورەدا چەند سستییێکی تێکەوت، بەڵام دوای ئاگربەس بە سوود وەرگرتن لە لاوازی و شکستی نەتەوەی تورك، چالاکییەکانی کۆمیتەکەیان دوو هێندە کرد و لە هەموو لایەکەوە یانەیان دەکردەوە.

*هەموو خەڵك، هەتا وەکوو ڕەشە خەڵکی نەخوێندەواریش، زۆر بە توندی ئارەزووی سەربەخۆیی کوردیان هەبوو.*

کەسێك بە ناوی شەریف پاشاوە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە نوێنەری وەفدی کوردییە لە پاریس و بە ناوی نەتەوەی کوردەوە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ هێزە گەورەکاندا. لەگەڵ کردنەوەی ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانیدا ساڵی ١٣٣٦[*]، من پڕۆژبایی خۆم نارد. *لە من*

---

[١٩] قاسم بەگ لەم زانیاریانەدا کەوتۆتە هەڵەوە، ڕاستیەکەی ئەم جەمعییەتە ناوی (جەمعییەتی تەعاون و تەرەقیی کورد) بوو کە لە ٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەمووڵ دامەزراوە، وەرگێر.

[*] مستەفا کەمال لە مانگی نیسانی ١٩٢٠ هەڵبژاردنێکی ڕێکخست. ئەندامانی ئەم هەڵبژاردنە لە ئەنقەرە کۆبوونەوە و ڕۆژی ٢٣ی نیسانی ١٩٢٠ ئەنجومەنی گەورەی

*تووڕەبوون و پێیان وتم: تۆ کە کوردی بۆچی بەلای تورکەکاندا* دەشکێیتەوە. لە زاری ڕەشید بەگەوە زانیم کۆمیتەیەك هەیە بە ناوی "کۆمیتەی سەربەخۆیی و ئازادیی کوردستان"ـەوە. بە گرووپی پێنج کەسی دەچنە ناوییەوە. هیچ گرووپێك نە گرووپەکەی دیکە و نە کەسەکانی گرووپەکەش دەناسێ. ویستیان ناوی منیش بنووسن، بەلاّم من کە ڕەتمکردەوە سوێند بخۆم، منیان پەسند نەکرد. ئەم شۆڕشگێڕانە پشتیان بە هاریکاری و پارەی ئینگلستان بەستبوو. ئەوان لە ٪۸۰ ڕای گشتییان بۆ خۆیان بردبۆوە و کاریان دەکرد بۆ ڕاکێشانی ئەوەی کە مابۆوە.

ئەوەیان کورتکردنەوەیەکی شۆڕشی کورد بوو.

***

١٥ی حوزەیرانی ١٩٢٥

لە دادگەی ئیستیقلال لە دیاربەکرەوە

کوڕەزاکەی مستەفای خنس، عەزمی ڕای دەگەیەنێ:

– من پانزە ساڵم، چەکم هەڵگرتووە، بەلاّم بەشداری شەڕم نەکردووە.

– عەلی، برای قاسم.– ئامانجی شۆڕش بریتیبوو لە سەربەخۆیی کورد. ئەوان ویستیان وەکوو وەسیلەیەك سوود لە ئایین وەربگرن. من هیچی تر نازانم.

***

---

نیشتمانیی تورك (*Türkie Büyük Millet Meclisi*) یان دامەزراند. ڕۆژی ٢٩ی نیسان کۆمیتەیەکی تەنفیزی هەڵبژێردرا و ئەم کۆمیتەیە بڕیاری وەرگرت کە پەرلەمانی نوێ حکوومەتی شەرعی و کاتیی وڵاتە و بە تێکڕایی دەنگیش مستەفا کەمال بە سەرۆکی ئەنجومەن هەڵبژێردرا، وەرگێڕ.

# La Justice Turque

Des clichés du journal « Wakit » turc du 27 Avril 1925.

Les traitres qui, entrant à El Azize, ont versé le sang innocent turc, payent leur crime sur les échafauds devant la caserne. (Wakid)

۲۸ی حوزەیرانی ۱۹۲۵

## داواکار داوای سەری

## پەنجا و سێ تاوانبار دەکات

وەکیل هەڵدەستێتەوە و دەست بە مورافەعەی خۆی دەکات و بە دەنگە برووسکەئاساکەی خۆی:

- هۆیەکان و بنچینەکانی دوایین شۆڕش کە لە هەرێمە رۆژهەڵاتییەکانی نیشتمانی سەرمەدیی تورکدا هەڵگیرسا، هاوشێوەی ئەوانە بوون کە ڕابوردوویێکی زۆر دوور لە بۆسنیا و هەرزەگۆڤینیا کە لە سێ لاوە بە ڕەگەزی غەیرە تورك و ئاموسڵمان دەورە درابوون، ئەوانەی کە وێڕای برایەتییەکی پێنج سەدە، ئەلبانییەکانیان گەیاندە ئەوەی وا لە دەورانی جەنگی باڵقان لە پشتەوە لە تورکیا بدەن. لە کاتێکدا تورکیا هەمیشە سۆز و خۆشەویستییەکی گەورەی بۆ هاونیشتمانییەکانی هەبوون. ئیدیال و ئامانجێك کە شۆڕشی کوردی لێوە سەرچاوەی گرت، هەمان ئەو ئامانج و ئیدیالە بوون کە سووریا و فەلەستینی دابڕی.

ئەوە هەمان تۆخم گەلن کە لە ناوەوەی وڵات و دەرەوەی وڵات کار دەدەن و ئەو ڕووداوانەی دواییا لێکەوتەوە.

ئاخاوتنی سەرۆك بۆ پەنجاوسێ تاونبارکراو بە سزای مەرگ:

برێك لە ئێوە بە ڕێنمایی خۆپەرستیتان، برێکی دیکەتان بە ئامۆژگاریکردنی بێگانە و چاوتێبڕینی سیاسی، *بەلام هەمووتان لە یەك خاڵدا یەك دەگرنەوە کە ئەویش بۆ دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆ چوونەتە پێش. ئێوە لەسەر پەتی سێدارە نرخی ماڵە ڕووخاوەکان، خوێنە ڕژاوەکان دەدەنەوە.*

لێرەدا ڕادەوەستین لەوەی وا زانیاری لە ڕۆژنامەی تورکی "وقت" وەربگرین و ئەو چەند دێڕە بەو ڕەوان نووسییەی خۆی پێویستی بە هیچ قسە لەسەر کردنێك نییە.

مێژووی کورد، بە تایبەت مێژووی ئەم چەند ساڵەی دوایی، زۆر بە ڕوونی ئەوە دەسەلمێنن کە نەتەوەی کورد زۆر شێلگیرانە بەرەو ئەو ئیدیالە دەڕوا کە هەموو نەتەوەکانی دیکە وەریانگرتووە و تورکەکان بە قەدەغەکردنی دەربڕینی وشەکانی کورد و کوردستان بەوەی وا بە هەتیوەکان، بەو کچۆڵەی قوربانیانەی کە سەرپیان بڕیون، بەوانەی بە کوردبوون تا وانبار کراون، دەڵێن تورك، پێیان وایە بەوە پرسی کورد چارەسەر دەکەن.

وێڕای ئەوەی هەموو مێژوو لێرەدا ئەوە دوورپات دەکەنەوە کە نیشتمانی ئێمە ناوی کوردستانە: کەچی تورکەکان پێ دادەگرن لەسەر ئەوەی کە پێی بڵێن هەرێمەکانی ڕۆژهەلات، ئەنادۆڵی ڕۆژهەلات، شەش ویلایەتەکە. کوردەکانیان ماوەیەکی دووردرێژ هەر بە ناوی گشتی موسڵمان ناو دەبرد، ئێستەش بە تورك ناویان دەبەن.

لە لۆزان کاتی گفتوگۆی پەیماننامەی ئاشتی، عیصمەت پاشا، سەرۆکی وەفدی تورك، درۆیەکی گەورەی کرد، بەوەی وا دووپاتی کردەوە هیچ جیاوازیێك لە نێوان کورد و تورك دا نییە و هەردوکیان لە مافدا یەکسانن. ئێمە عیصمەت پاشا، هەر بە قسەکانی خۆی بە درۆ دەخەینەوە. بۆ ئەمە جارێکی دیکە لە ڕۆژنامەی تورکی "وقت" وەرگیراوی گوتارێکی عیصمەت پاشا وەردەگرین کە عیصمەت پاشا خۆی لە ئەنقەرە، لەبەردەم کۆنگرەی کۆمیتەی پان-تورك (تورك ئۆجاغی)دا پێشکەشی کردووە:

ڕاستیەکەی لە ژمارەی ڕۆژی ٢٧ی نیسانی ١٩٢٥ی ڕۆژنامەی "وقت"دا ئەمە دەخوێنینەوە:

*هاوخەباتکارانی ئەندامی کۆمیتەی پان-تورک، ئێوە تەواو شانازی بەوەوە بکەن کە سەر بە نەتەوەی تورکن. نەتەوەی تورک لە سەرووی هەموو نەتەوەیەکی دیکەیە. ئەوەی کە دان بەم سەربەستەییەدا نانێ، لەگەڵ ئێمەدا لەشەڕدا دەبێ.*

بۆ ئەوەی ئێمە هاوتا بین لەگەڵ تورکدا، دەبێ ببینە تورک. هەتا بمانەوێ وەك کورد بژین، ئەوا ستەم و مەرگ چاوەڕێمان دەکات. چۆن دەبێ خەیاڵ بکرێ بشێ بکرێینە تورک! نابێ بەلای کەمییەوە ئەو نەتەوەیە وا دەیەوێ بمانتوێنێتەوە، بە ڕەگەز، بە شارستانی، بە کولتوور و بە ڕۆح لە ئێمە سەرووتر بێت. ئەوە ڕاستە کە سیمای تورك شەش سەدە دەبێ لە سایەی چەرکەس، گرێك، بوڵگار، سێرب، ئەرمەنی، ولاش*، کورد، عەرەب و جوولەکەوە تەواو بووە. بەڵام وێڕای ئەمە، تورك هەرگیز نەیتوانیوە خۆی لە ڕۆحی ئاتیلا**، جەنگیز*** و هۆلاکۆیەکان ڕزگار بکات. ڕوحەکەی وەك خۆی بۆ هەمیشە هەروا دەمێنێتەوە.

چۆن داوا لە کورد دەکەن دان بە ژێردەستەییدا دابنێ بۆ نەتەوەیەکی کۆچەر کە بە جلی دڕاو و کۆچەرییەوە هاتوونەتە سەر ئەو زەوییەی کوردەکان کە شەش هەزار ساڵە تێیدا دەژین. سەحاڵبوونی ئەم زەلیلییە لەبەر چاودا ڕون و ئاشکرایە. تورك بەرامبەر بە ڕەتکردنەوەی شێلگیرانەی کورد بۆ قەبووڵکردنی ئەم

---

* Vlaches
** Attila
*** Djinguize

شەرمەزارییە، بە تایبەت لەوەی وا ساڵی ١٩٢٥ دەستیان کردووە بە قەڵاچۆکردنی سیستماتیکی کوردەکان؛ بۆ گەیشتن بەم مەبەستە دوو ڕێوشوێنیان لەبەرچاو گرتبووە: قەتڵوعامی ڕاستەوخۆ و ڕاگوێزان.

قەتڵوعام چەندین شێوەی جیاواز بەخۆیەوە دەگرێ: حوکمی لەسێدارەدان کە لە دادگە کاتی ئیستیقلال، دادگە عەسکەرییەکان، دادگە ئاساییەکان دەردەچێ ـ ویرانکردنی شار و ئاواییەکان بە تۆپ، میترالیۆز، فڕۆکەی جەنگی، لەشکرکێشیی سەربازی بە بیانووی بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی بەرگری.

ڕاگوێزان شێوەیەکی دیکەی قەتڵوعامە. کوردستان بە سەرما بەناوبانگە. بەتایبەت ماوەی مانگەکانی کانوونی یەکەم، کانوونی دووەم و شوبات سەرمایەکەی زۆر سەختە. دەرکردنی بەزۆر، لەناو ماڵ و حاڵی خۆیاندا لە ماوەی ئەم مانگانەدا، هەزاران خەڵکی کوردستان هەموو موڵك و ماڵیان دەستی بەسەردا دەگیرێ و بەزۆر بە پێیان پەڕیوەی گۆشەیەکی دیکەی تورکیا دەکرێن. ئەگەر ئەمە بە قەتڵوعام دانەنرێ، دەبێ بە چی ناو بنرێ.

حکوومەتی تورك ئەم مانگانەی هەڵبژاردووە بۆ ڕاگوێزانی کوردەکان، بۆ ئەوەی کوردەکان لە بایەزید و دەوروبەری هەڵبقەنێ و پەڕیوەی (سمیرنا)یان بکات. بێگومان هەتا سەدا دەی ئەم پەڕیوانەش ناگەنە سمیرنا.

کچ و ژنان کە بە زیندوویی لەناو کەلاوەکانی شار و ئاواییە بۆمباردومانکراوەکاندا مابوونەوە، کۆکرانەوە و بە کۆمەڵ بردرانە شارە تورکییەکان بۆ بەشینەوەیان بەسەر بەگزادە و کارمەندە تورکەکاندا. لە دەوروبەری بایەزید، ٢٠٠٠ ژن، منداڵ و پیرەمێرد

لەنا و کادێن و پەناگەکانی ژێر زەوی گیریان خواردبوو، بە زیندوویی ژێر خاك نران. لە باکووری گۆلی وان پیاوەکانی بیست و حەوت بنەماڵە کە رایان کردبوو، ژن و منداڵەکانیان لە لایەن تورکەکان سەربڕان، سەری بڕاویان خرابوونە سەر ئەسپ و بۆ ماوەی شەش رۆژ لە ئەرجیش، لە عادل جەواز و ناوایيەکانی دیکە دەیانسوڕاندنەوە و بۆ چاوترساندن نیشانی خەڵکیان دەدا. لە چەپەقچوور، هەژدە کچی کورد، ئەوانەی کە نەیانهێشتبوو ئەفسەرانی تورك تێر بکەن، بەزۆر دەستدرێژییان کرایە سەر و پاشان درانە دەست ئەو سەربازانەی کە هەوەسی حەیوانیان پێ تێردەکردن و لەمنا و ئەم چیایانە بە تەنیا بەجێیان هێشتن. بەشێکی ئەم بەدبەختانە گوللەباران کران، هەندێکی تریان فڕێدرانە نا و رووبارەکان و هەندێکی دیکە لەنا و ئەم موعاناتە لەناوچوون. یەکێك لەوانە کە لە لایەن کوردەکانەوە رزگارکرابوو و توانرا بگاتە سوریا، لەوێ بە تێلەشکاوی و تێکچوو دەژی و شایەدحاڵی بەدبەختانەی ئەم تراژیدیایە. زازاییەکان کە بەشێکی چالاکی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ بوون، لەوساتەوە تورکەکان بەتایبەتی تۆڵەیان لێدەسەنەنەوە.

سێ ساڵ دوای شۆڕش، چەند مانگێك بەر لە ئێستە، حکوومەتی تورك کاتێك بەوەی زانی ٢٥٠ زازا، ژن و پیاو لە دیاربەکر وەك کرێکار و خزمەتکار بە بێوەیی کار دەکەن، کۆیکردنەوە، بە گرووپ بۆ دەرەوەی شاری بردن و بێبەزەییانە گوللەبارانی کردن.

تورکەکان بەرامبەر بە کوردەکان زۆر وەحشیگەرانەتر ئەو ستەمکارییە دەنوێنن کە کاتی جەنگ بەرامبەر بە ئەرمەنییەکان پیادەیان کرد. ئێمە تەنها داوای چەند کۆمسیۆنێکی بەدواداچوون دەکەین کە نوێنەرایەتی کۆمەڵە خێرخوازییەکانی ئەورووپا و ئەمریکا

بن و بچن سەیری ئەو ڕەوشە نەسەقبار و تراژیدیانەیان بکات کە پاشماوەی نەتەوەی ئێمەی تێدا دەژی لەو هەرێمە تورکیانەی وا بۆیان ڕاگوێزراونەتەوە و ئەوەی دەیبینن بە هەموو جیهانی ڕابگەیەنن.

ئەگەر تورکەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن، ئەوان ویژدانیان ئارام و دەستیان خاوێنە، نابێ ڕێگە لە سەفەری ئەم کۆمیسیۆنانە بگرن.

ئەو داوایانەی کە چەندین جار پێشکەش بە کۆمەڵەی گەلان کراون، بە بێدەنگیێکی پەردەپۆشکراو پێشوازییان لێکراوە. تورکەکان وزەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆ ئەوەی ئەو قەسابخانە تۆقێنەرە کە بەسەر سەرپاکی نەتەوەیەکیدا جێبەجێی دەکەن، لەبەرچاوی جیهانی بشارنەوە. نیشتمانی جوانی ئێمە خەریکە دەبێتە مشتێك لە وێرانی.

نەتەوەی ئێمە لەسەر هەقی خۆی بەهێزە، لەسەر هەقانیەتی پرسەکەی: بەرامبەر بە تۆقێن و دەستدرێژییەکانی تورك بەرگری لە خۆی دەکات و بە گەورەترین وزە بەرەنگاری دەکات. ئەگەر ئێمە دەمانەوێ ئەو ڕاستیانە بگەیەنینە دونیای شارستانیخواز، ئەمە لە بەرژەوەندی ئەویش دایە. بە ڕووناکیی ئەم ڕاستیانەدا، دونیای شارستانی لەگەڵ زیاتر وریایی و زیاتر دادوەریدا دەتوانێ هەڵسوکەوتەکانی خۆی لە دژی تورکیا دیاری بکات. ئەوەی جێگەی گومان نییە ئەوەیە کە ئەو ئاگرەی وا تورکەکان لەم گۆشەیەی جیهاندا دایانگیرساندووە، بە ئاسانی ناکوژێتەوە تا وەکوو نەتەوەکان گوێی پێنەدەن.

ئەگەر کۆمەڵەی گەلان دەیەوێ شەرافەتمەندانە ئەم ناوە هەڵبگرێ، نابێ بە هیچ شێوەیەك بەرامبەر بە قەتڵوعامی نەتەوەیەکی

وەكوو ئێمە بێدەنگ بێت. چونكە، ئەگەر كۆمەڵەی گەلان هەر سوورە لەسەر ئەوەی ئەم بێدەنگییە شەرمهێنە قەبووڵ بكات، ئەوا ئێمە هەقی ئەوەمان دەبێ كە هەر تەنها وەك "كۆمەڵەی دەوڵەتان" تێی بڕوانین كە تەنها خزمەتی بەرژەوەندی بەهێزەكان دەكات. ئەو كۆمەڵەیەی گەلان ئەو پەیمانە پیرۆزەمان وەبیردەهێنێتەوە كە سەدەكانی رابووردوو لە نێوان بەهێزەكاندا دەبەسترا بۆ پەلوپۆكردنی بێهێزەكان و ڕێگە لێگرتنیان لە هەموو هەڵوێستێكدا و بێدەنگكردنیان.

ئایا جیهانی شارستانی بەردەوام دەبێ لەوەی تا كۆتایی چاو لەو قەتڵوعامە بێڕەحمانە و وەحشیگەرانەیەی نەتەوەیەكی پێنج ملوێن كەسی بقووچێنی تا وەك ئاژەڵی زیانبەخش قەلاچۆ دەكرێن. ئایا ویژدانی یاخی نابێ و بەرامبەر بەو تاوانەی دەورانی مرۆڤایەتی بێزی نایەتەوە؟ هێزە گەورەكان كە بۆ ماوەی چوار ساڵ جەنگان و بە دەنگی بەرز بانگی پاراستنی مافی نەتەوە بێهێز و چەوساوەكانیان دەكرد و هەزاران ڕۆڵەی خۆیان بۆ ئەم بەرگرییە كردە قوربانی، ناكرێ– بەلای كەمییەوە لەبەر ڕێزگرتن و بۆ وەفاداریی بۆ ئەو خوێنەی كە بەخشندانە ڕژا– درێژە بە ڕێپێدانی ئەم قەتڵوعامە نەدەن كە وەك دەورانی قەتڵوعامی ئەرمەنییەكان، بە سەدان، بە هەزاران مرۆ، ژن، پیرەمێرد و منداڵ بە دەقیقەیەك لەناو چوون.

بە سەدان كچ دوای ئەوەی بە شێوەیەكی وەحشییانە دەستدرێژیان كرایە سەر، بە زەبری سەرەنێزە سكیان هەڵدڕا. گرووپێكی دیكە بەرەو ئەنقەرە نێردران و فڕێدرانە ناو لەوەڕگەكان بۆ ژێردەستی كارمەند، ئەندام پەرلەمان و ئەفسەرانی تورك. ئێمە خەریكی ڕیزبەندكردنی بەڵگەنامەكانی ئەم قەتڵوعام و زەبرو

زەنگەین لەوەتای دەستپێکردنیانەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ و بەرە بەرە بڵاویان دەکەینەوە.

بە ڕێنیشاندەریی ئەم هەموو ڕووداوانە، بە ئیلهام وەرگرتن لەم تۆقینە. نیشتمانپەروەرانی کورد ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧ لە کۆنگرەیەکدا کۆبوونەوە و گفتوگۆ و تاووتوێی ئەو هەنگاوانەیان کرد کە دەبێ بگیرێنە بەر بەرامبەر بە تاوانی قەڵاچۆکردنی ڕەگەزەکەیان و کۆمیتەی (خۆیبوون)یان پێکەوەنا.

کۆمیتەی خۆیبون نوماینەدەی بەوەفا و ڕاستگۆی نەتەوەی کوردە و شێلگیرانە بڕیاری داوە بەرامبەر بە هەموو بە ئاستەنگەکان خەبات بکات. کۆمیتەی (خۆیبوون) نوێنەری توانا و هێزی ویستی کوردە، پەیمانێکی نیشتمانیی پەیڕەو کردووەوە سوێندی خواردووە بە هەر نرخێك بێ بیهێنێتە جێ.

پەیمانی نیشتمانیی کورد بریتییە لە سوێندی خەبات تا دوایین کورد و دوایین گوللە بۆ ئازادیی خاکی نەتەوەیی کورد کە لە هەزاران ساڵەوە تاقە خاوەنی نەتەوەی کوردە" دڵنیاکردنەوەی نەتەوەی کوردە لەسەر خاکی نیشتمان و هەقی ژیانێکی ئازاد، بەختەوەر و سەربەخۆ. پرەنسیپی بنچینەیی کۆمیتەی خۆیبوون بریتییە لە ڕێزگرتنی هاوسێیەکانی و ڕێزلێگرتنی لە لایەن هاوسێیەکانییەوە.

ئێمە نە هیچ چاوتێبڕین، نە بانگەشەمان دژی ئەو نەتەوانە نییە کە لەودیوو ناو سنوورەکانی ئێمەدا دەژین.

ئێمە دەمانەوێ خاکی نیشتمان لەژێر پۆستاڵی تورك ڕزگار بکەین، وەکوو مرۆڤ تێیدا بە ئاشتی بژین و تەنها چاومان لە پێشکەوتن و شارستانی بێت و حکوومەتێکی نیشتمانیی تێدا دروست بکەین. ئەوە نەتەوەی کوردە کە بەردەوام دەبێ لەوەی وا

بەتەنها لەژێر دەسەڵاتی تێکدەرانە و بەربەریستانەی تورکدا بەرگری بکات" بۆچی بێبەش بن لە ماق پێکەوەنانی بەڕێوەبەرایەتێکی نیشتمانیی، دوور لە هەموو دەست تێوەردانێکی تورك، لەسەر ئەو خاکەی کە زۆرینەیەکی هاوڕەگەز و زیاتر لە زۆرینەی ڕەها پێکدەهێنن. ئێمە تەنها ڕقمان لە ستەمگەریی تورکە. ئەم مافە، مافێکی پیرۆز و ناسراوی هەموو نەتەوەکانە کە لەوەتای دەورانی هەرە کۆنەوە، مافی ئەوەی ڕێگە نەدەی کۆیلە بکرێی، بکوژرێی، قەدەغە بکرێ. ئێمە دووبارەی دەکەینەوە کە ڕێگەی خەبات سەخت و خوێناوی دەبێ، بەڵام ئەم خەباتە تەنها بە دوایین گوللە و دوایین کورد کۆتایی دێت.

تەواو

نیزامنامەی گشتیی و پەیماننامەی ناوەخۆیی
کۆمەڵەی خۆیبوون

Hariciye İstihbaratı :

# I. Muhalifler
# II. Hoybun nizamnamesi

---

**Mahrem ve**
**hizmete mahsustur**

---



Hariciye Vekâleti Matbaası

**نیزامنناممەی خۆیبوون بە تورکی**

# Taşnak-Hoybun

**ANKARA**

**1931**

**T. O. Matbaası**

نامیلکەی تاشناق-خۆیبوون

# THE CASE OF KURDISTAN AGAINST TURKEY

FLAG OF KURDISTAN

*BY AUTHORITY OF*

HOYBOON

SUPREME COUNCIL OF THE KURDISH GOVERNMENT

بلاوکراوەی ژمارە ١ی خۆیبوون بە ئینگلیزی

PUBLICATION
DE LA
LIGUE NATIONALE KURDE
HOYBOUN
No 2

# LES MASSACRES KURDES EN TURQUIE

LE CAIRE
IMP. PAUL BARBEY
1928

بڵاوکراوەی ژمارە ٢ی خۆیبوون بە فەرەنسی

PUBLICATION

KURD'S NATIONAL LEAGUE

THE MASSACRES OF KURDS IN TURKEY

CAIRO

بڵاوکراوەی ژمارە ٣ (؟) خۆیبوون بە ئینگلیزی

**بڵاوکراوەی ژمارە ٤ (!) کە بە تورکییە**

**تا ئێستە دیار نییە**

جمعية خويبون الكردية الوطنية

﴿ النشرة الخامسة ﴾

# القضية الكردية

## ماضي الكرد وحاضرهم

احسان نوري باشا القائد العام للقوات الكردية الوطنية

مع بعض رجاله

للدكتور بله چ شيركوه

١٣٤٩ – ١٩٣٠

مطبعة السعادة بجوار محافظة مصر

بڵاوكراوەی ژمارە ٥ی خۆیبوون بە عەرەبی

# LA QUESTION KURDE

## ses origines et ses causes

Par

Le Docteur BLETCH CHIRGUH

PUBLICATION

de la

LIGUE NATIONALE KURDE

HOYBOUN

No 5

IHSAN NOURI PACHA

Généralissime des forces nationales kurdes.

LE CAIRE

IMPRIMERIE PAUL BARBEY

1930

بلاوکراوەی ژمارە ٥ی خۆیبوون بە فرەنسی

Celadet Alî Bedirxan
(Herekol Azîzan)

# DE LA QUESTION KURDE

LA LOI DE DÉPORTATION ET DE DISPERSION DES KURDES

avesta

بلاوکراوەی ژمارە ٧ یان ٨ی خۆبیوون بە فرەنسی

بلاوكراوەی ژمارە ٨ی خۆیبوون بە عەرەبی و بە تورکی

SHEIK SAID OF PIRAN

He led the Kurdish Revolution of 1925. His immediate command was cut off from the main force, and he fell into the hands of the Turks, and was hanged.

His last words were, [illegible]

## شێخ سەعیدی پیران

(١٩٢٥-١٨٦٥)

نەخشەی وڵاتی کوردستان و ئەرمینیا

سەرچاوە: Sureya Bédir Khan, *The Case of Kurdistan against Turkey*, 1928.

شێخ سەیید عەبدولقادر لەبەردەم پەتی سێدارەدا

DR. FUAD

A Kurdish patriot, participated in the Revolution of 1925, and hanged by Turks.

دوکتۆر فوئاد

سالی ١٩٢٥ لە سێدارە در

HASSAN HAIRI

Deputy of Dersim in Turkish Parliament, a leader of Kurdish Revolution, hanged in 1925 by Turks.

حەسەن خەیری

ئەندام پەرلەمانی دێرسیم، ساڵی ١٩٢٥ لە سێدارە درا

• ئیحسان نووری پاشا (ژێنێراڵ) (بتلیس ١٨٩٢- تاران ٢٥ی ئاداری ١٩٧٦). ژێنێـراڵ و پیـاوی سیاسیی کـورد، دەرچووی ئەکادیمیای سـەربازی ئەسـتەمبووڵ و ژێنێراڵـی سـوپای عوسمـانی بـوو و لـە بـەرەکانی یەمـەن و ئـەلبانیا و ڕووسـیا و یۆنـان شـەڕی کـردووە. بەشـداری جـەنگی سـەربەخۆیی تورکیـاش بـووە و سـاڵی ١٩٢٤ پێوەندییـەکانی لەگەڵ تورکـدا بڕیوە و پێوەنـدیی بـە هێـزی کـوردوە کردووە. ساڵی ١٩٢٧ لە لوبنان سەرکردایەتیی (خۆیبوون)ی کردووە. یـەکێك لـە کۆڵەگـە سـەرەکییەکانی شۆرشـی چیای ئـارارات (١٩٣٠-١٩٣٢) بووە و دوای تێکشکانی شـۆڕش پـەڕیوەی تـاران بـووە و و ماوەی چل ساڵی ژیانی ئاوارەیی لە تاران بەسەر بردووە.

***

•ئـەکرەم جـەمیل پاشـا (دیاربـەکر ١٨٩١-دیمەشـق ١٩٧٤). پیـاوی سیاسیی کورد بووە. دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی چووەتە ئەستەمووڵ و دواتر دوای تەواوکردنی خوێندن لە ئەستەمووڵ ساڵی ١٩١٢ بە ئامۆژگاریی باوك و دایکی چووەتە لۆزان بۆ تـەواوکردنی خوێنـدنی بـەرز و لـەوێ لقـی کۆمەڵـەی هێڤیـی قوتابیـانی کـوردی دامەزرانـــدوە. لەگـــەڵ دەســـتپێکی یەکـــەم جـــەنگی جیهانییـــدا ئیمپراتۆریـای عوسمـانی بـانگی هـەموو قوتابیـەکانی کردووەتـەوە لـە دەرەوە، ئەکرەم گەڕاوەتەوە بۆ وڵات. ساڵی ١٩١٦ ڕەوانـەی دیاربەکر کـراوە و لـەوێ (جەمعییـەتی کوردسـتان)ی دامەزرانـدوە، بـەڵام ئـەم جەمعییەتـە قەدەغـە کـراوە و چـووەتەوە بـۆ ئەسـتەمووڵ و بەشـداری دامەزرانـدنی جەمعییـەتی تـەعالیی کوردسـتان بـووە و هاریکـاریی گۆواری (ژین)ی کردووە. زستانی ١٩٢٢ گیراوە و ڕەوانـەی زینـدانی دیاربـەکر دەکـرێ، دواتـر ئـازاد بـووە و سـەروبەندی شۆڕشـی ١٩٢٥

جارێکی دیکه گیراوه و ڕەوانەی زیندانی قستەمونی کراوه. دوای سێ ساڵ ئازاد بووه. ساڵی ١٩٢٩ ڕای کردووەته شام و لە حەڵەب نیشتەجێ بووه و بەشداریی لە خۆیبووندا کردووه. ساڵی ١٩٤٧ تا ڕۆژی مردنی لەگەڵ منداڵەکانی له دیمەشق دانیشتووه.

***

• تۆماس ودرۆ ویلسن (ڤێرجینیا ١٨٥٦/١٢/٢٨- واشنگتۆن ١٩٢٤/٠٢/٣). خوێندنی یاسای تەواو کردووه و لە چەندین دامەزراودا وەکو مامۆستای زانستە سیاسییەکان کاری کردووه. بۆ ماوەی ١٩١٢ تا ١٩٢١ سەرکۆماری ئەمریکا بووه. ساڵی ١٩١٧ ئەمریکا هاتە ناو جەنگەوه و ساڵی ١٩١٨ له کۆتایی جەنگدا ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە جەنگدا و دواتر بەشداریی کۆنگرەی ئاشتیی (ڤێرسای) بوو و پێشنیاری دروستکردنی کۆمەڵەی گەلانی کرد.

***

• جەلادەت بەدرخان (١٨٩٣سووریا ١٩٥١). کوڕی ئەمین عالی، کوڕی گەورەی میر بەدرخان بەگە. دیپلۆمی لیسانسی یاسا لە کۆنستانتینۆپل وەرگرتووه و دواتر خوێندنی لە ئەڵمانیا تەواو کردووه ساڵی١٩٢٧ بە سەرۆکی کۆمەڵەی خۆیبوون هەڵبژێردراوه. یەك لە پیاوە دیپلۆمات و چالاکەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بوو. دوای شکستی بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی باکوور پەڕیوەی شام بوو و خۆی زیاتر بۆ کاری کولتووری تەرخان کرد.

***

• سەیید عەبدولقادری شەمزینانی ( ١٨٥١- دیاربەکر ١٩٢٥). سەرکردەی ئایینی و سیاسیی کوردبوو. کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە. پیاوی سیاسیی عوسمانی و سیناتۆری وان بوو. ساڵی

۱۸۸۱ دوای تێکشکانی ڕاپەڕینی ساڵی ۱۸۸۱ لەگەڵ باوکیدا ڕەوانەی مەککە دەکرێ و ساڵی ۱۹۰۸ دوای کودێتای تورکە- لاوەکان هێنرایەوە بۆ ئەستەموول. یەکێك لە لایەنگرەکانی تیۆری ئۆتۆنۆمی بوو بۆ کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا و دواتر لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کەمالیزم (لە دەورانێکی زۆر زوو)دا دژی ئەوە بوو کە کورد دژی تورك چەك هەڵبگرێ. ساڵی ۱۹۲۵ بە بیانووی بەشداریکردن لە شۆڕشی ۱۹۲۵دا بەدیلگیرا و دواتر لەسێدارە درا.

***

• شەریف پاشا ( کۆنستانتینۆپل ۱۸٦٥- ناپۆلی ۱۹٥۱/۱۲/۲۲). دیپلۆمات و پیاوی سیاسیی کورد و لە بنەماڵەیەکی نەجیبزادەی کورد لەدایك بووە. خوێندنی لە کۆنستانیتنۆپل دەست پێکردووە و دواتر لە ۱۸۸٥ تا ۱۸۹٤ لە پاریس لە قوتابخانەی سەربازی Saint-Cyre درێژە بە خوێندن داوە. لە ساڵی ۱۸۹٤ تا ۱۹۰۸ بووەتە باڵوێزی حکوومەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم. دوای کۆدەتای ساڵی ۱۹۰۸ی تورکە لاوەکان گەڕاوەتەوە بۆ کۆنستانتینۆپل و لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و سەیید عەبدولقادردا جەمعییەتی تەعاون و تەرەقیی کوردیان دامەزراندووە، بەڵام شەریف پاشا هەر هەمان ساڵ گەڕاوەتەوە بۆ پاریس و سەرەتا لە پاریس و دواتر لە مۆناکۆ نیشتەجێ بووە و ساڵی ۱۹۱۹ بووە بە سەرۆکی وەفدی کوردستان بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی و لە ۲٤ی نیسانی ۱۹۲۰ بە هۆی دەربە کوردەوە وازی هێناوە.

***

• شێخ سەعیدی پیران (پالو ١٨٦٥-دیاربەکر ١٩٢٥). پیاوی ئایینی و سیاسیی کوردبوو. دوای مردنی باوکی (شێخ عەلی سەپتی: لە تەریقەتی نەقشبەندی) شێخ سەعید چووەتە لای شێخ مەحموودی مامی. بەمشێوەیە بە چاودێریی مامی خوێندنی ئایینیی تەواو کردووە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٤-ەوە سەرکردایەتیی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی لە کوردستانی باکوور گرتووەتە دەست. شوباتی ١٩٢٥ لەگەڵ هەزاران لە باوەڕدارەکانیدا گەیشتە پیران. هەرێمی دیاربەکر. لە سۆنگەی پێکدادانێکەوە لەگەڵ دەسەڵاتکارانی ناوچەکەدا شۆڕش لە ٨ی شوباتی ١٩٢٥ بەرپا بوو و بە زوویی زۆرترین بەشی کوردستانی باکووری گرتەوە. پێشمەرگەکان هەتا بن دەرگەی دیاربەکر چوون. بەڵام ٣١ی ئاداری ١٩٢٥ زۆر بێڕەحمانە شۆڕشەکە دامرکێندرایەوە. شێخ سەعید لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا لەسەر ئەوە بوون بگەنە ناو سنووری ئێران، کاتێک لەسەر پردی عەبدولڕەحمان پاشا لە وارتۆ بەدیل گیران. شێخ سەعید بە دیلکراوی هێنرایە دیاربەکر و لە دادگەی سەربازیی دیاربەکر سزای مەرگی بەسەردا سەپێندرا و ڕۆژی ٤ی ئەیلوولی ١٩٢٥ لە دیاربەکر لەگەڵ ٤٩ لە هاوەڵەکانیدا لەبەردەم پارێزگا لەسێدارە درا.

***

•عەبدولڕەزاق بەدرخان بەگ ( ١٨٦٤-١٩١٨) کوڕی نەجیب پاشای کوڕی بەدرخان بەگی میری گەورەی بۆتانە. دوای ئەوەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکانی خوێندووە و زمانی فرانسیی خوێندووە و دیپلۆمی باڵای لە پەروەردەدا وەرگرتووە، سێ چوار ساڵێک لە وەزارەتی دەرەوە وەکو فەرمانبەر کاردەکات و دواتر بووەتە سکرتێری سێیەمی باڵوێزخانەی ئیمپراتۆریای عوسمانی لە پیتەر بۆرگ.

سوڵتان، بە مەبەستی دوورخستنەوەی لە کاری سیاسی و خستنە ژێر چاودێریی خۆیەوە، کردوویە بە سەرۆکی دیوان لە کۆنستانتینۆپل. دواتر ڕای کردووە و گەلێك ئازار و زیندان و ئەشکەنجە و دوورە وڵاتی چێشتووە. یەکێکە بووە لە سەرکردە منەوەرەکانی کورد و پرۆ ڕووس بووە. دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر بێ نەوا ماوەتەوە و دواتر سالی ١٩١٨(؟) کەوتوەتە بەردەستی تورکەکان و بێ سەروشوێنی کراوە.

***

• کامەران بەدرخان (ئەستەموول ٢١ ی ئابی ١٨٩٥- پاریس ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٨). نووسەر و پیاوی سیاسیی کوردبووە. سالی ١٩١٢ کاتی جەنگی باڵقان لایەنگری تورکەکان بوو. یەکێك لە دامەزرێنەرانی جەمعییەتی تەعاون و تەرەقیی کورد بووە، گەلێك وتاری لە گۆواری "ژین"دا لەسەر پرسی کورد بلاو کردۆتەوە. دوای تەواوکردنی خوێندن لە لایپزیك لە ئەڵمانیا، گەڕاوەتەوە بۆ بەیرووت و مەکتەبی موحاماتی کردووەتەوە. ساڵانی ١٩٣٠-١٩٤٠ کۆمەڵێك وتار و کتێب بلاو کردووەتەوە و سالی ١٩٤٧ هاتووەتە پاریس و لە قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەلاتییەکان وانەی زمانی کوردی (کرمانجی)ی وتووەتەوە و ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردیی دامەزراندووە. سالی ١٩٧٠ بووە بە زمانیحالی بارزانی ئەورووپا.

***

• فوئاد پاشا (دوکتۆر) (چینار ١٨٦٧-دیاربەکر ١٩٢٥). پزیشك و پیاوی سیاسیی کورد بووە. دوای تەواوکردنی خوێندنی پزیشکی لە ئەستەموول، لە نەخۆشخانەی گشتیی ئۆرفە کاری کردووە. یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی هیڤیا ١٩١٢ و ئەندامی جەمعییەتی

تەعالیی کوردستان بووە و یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی کوردیی (ئازادیی) بووە-١٩٢٣. ماوەیەك بەر لە شۆڕشی ١٩٢٥ خەریکی دەرکردنی گۆوارێك بوو بە ناوی (میزۆپۆتامیا)وە. بە بیانووی بەشداریی لە شۆڕشی ١٩٢٥وە دەستگیر کراوە و بەرامبەر بە پارێزگای دیاربەکر لە سێدارە دراوە.

***

● دوکتۆ ئەحمەد نافیز (١٩٠٢ ئەلعەزیز-قامیشلۆ ١٩٦٨). پیاوی سیاسیی کورد بووە. خوێندی پزیشکیی تەواو کردووە و برا گەورەی نورەددین زازایە. لە دوای شکستی شۆڕشی کورد ساڵی ١٩٢٥ ئاوارەی سووریا بووە و بەشداریی لە دامەزراندنی خۆیبوون دا هەبوە و یەکێك لە بیچمە گرینگەکانی ناسیۆنالیزمی کورد بوو لە ساڵانی سیەکان و چلەکاندا.

***

● خالید جوبران بەگ (ئەلگوز ١٨٨٠- بتلیس ١٩ی ئاداری ١٩٢٥). پیاوی سیاسی و کۆلۆنێلی سوپای عوسمانی بووە. یەکێك لە ئەندامە گرینگەکانی هۆزی (جوبران) و هاوسۆزیی لەگەڵ جەمعییەتی تەعالیی کوردستان دا هەبوە و لەگەڵ چەند رووناکبیرێکی دیکەی کورددا (کۆمیتەی کوردستان)یان دامەزراندوە. چالاکانە بەشداری لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ دەکات و لەگەڵ یوسف زیا بەگ پێکەوە لە ١٩ی ئاداری ١٩٢٥دا لە بتلیس لەسێدارە دراون.

● یووسف زیا بەگ (بتلیس؟- بتلیس ١٩ی ئاداری ١٩٢٥). پیاوی سیاسیی کورد و ئەندام پەرلەمانی بتلیس بووە لە ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی ئەنقەرە و ئەندامی دادگەی سەربەخۆ بوو لە قستەمۆنی لە ماوەی جەنگی سەربەخۆیی تورکدا ١٩١٩-١٩٢٣.

کۆتایی ساڵی ١٩٢٤ پێوەندیی لەگەڵ کەمالیستەکاندا بڕیوە و خەبات بۆ سەربەخۆیی کوردستان کردووە. چالاکانە بەشداریی لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥دا هەبوە دەستگیر کراوە، لە ١٩ی ئاداری ١٩٢٥ لە بتلیس لە سێدارە دراوە.

# ئیندێکسی ناو و شوێن*

## I

## ئیندێکسی ناو

### ئا



### ب



* لەم ئیندێکسەدا هەموو ناوە زۆر دووبارەبووەکانی وەک: کورد، کوردستان و تورک لەبەر زۆر دووبارەبوونەوەیان نەخراونەتە ناو ئەم ئیندێکسەوە.

## ش



## ع

ف



ق



ك



ل



م

ن



و



ی

# II

## ئیندێکسی شوێن

### ئا



### ب

پ



ت



ج



چ



ح



د



س